تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

عەبدوڵڵا پەشێو

# پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە

شیعری ١٩٦٥-١٩٧٩

* ئەم بەرهەمە، یەکەمجارە، بە سەرپەرشتی و لەژێر چاودێریی عەبدوڵڵا پەشێو خۆی، چاپ دەکرێ و هەموو چاپە ساختەکانی پێشتر پووچ دەکاتەوە.

* هەر کەسێک ئەم بەرهەمە، بێ پرسی دانەر، کۆپی بکا یا چاپی بکاتەوە، لە ڕێگەی دادگـــاوە تووشـی سزا دەبێ.

* لەسەر ئەرکی کاک جەمیل محەمەد عومەری برای شاعیر چاپ کراوە.

ئەم بەرگە تاکە سەرچاوەی ڕاستەقینەیە بۆ خوێندنەوەی:

* فرمێسک و زام
* بتی شکاو
* شەونامەی شاعیرێکی تینوو
* دوانزە وانە بۆ منالان و چەند شیعرێکی قەدەغە
* شەو نییە خەونتان پێوە نەبینم

* پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە
* عەبدوڵڵا پەشێو
* کاری تەکنیکی: سەرکەوت وەلی
* بیرۆکەی هونەریی بەرگ: قەرەنی جەمیل
* دیزاینی بەرگ: عوسمان پیرداود
* لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (١٠٠
سالّی ٢٠٠٦ی دراوەتێ.
* چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر
* تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

عەبدوڵڵا پەشێو

# پشت لە نەوا
# و
# ڕوو لە کرێوە

چاپی یەکەم

کوردستان 2006

# بەرکوڵ

بیست ساڵ زێترە، لە کوردستان بەگشتی و لە ڕۆژهەڵاتی نیشتمان بەتایبەتی، دیوانەکانم بێ پرسی من چاپ دەکرێن.
لەو چاپە بێنموود و پڕ هەڵە و پەڵانەدا بەروبوومی چل ساڵی ژیانم شێوێنراوە. شیعرە جگەرگۆشەکانم، لە بەر چاوی زەقی دەسەڵاتی خۆیی و بێگانەدا، لەسەر شەقامەکان بە سەربڕاوی کەوتوون.

* * *

پێم خۆشە جارێکی تریش هەموو خۆشەویستانم ئاگادار بکەمەوە، کە ئەو دیوانانەی بێ ئاگاداریی من چاپکراون دەستیان تێوەردراوە، بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە ناشێن.
ئەوەی بە من کراوە باوەڕ ناکەم، بەدرێژاییی مێژووی چاپەمەنی، بە نووسەرێکی تری زیندوو کرابێ.
شێواندنی بەئەنقەستی بەرهەمەکانم و چاونووقاندنی لایەنە پەیوەندیدارەکان هەوڵی کوشتنمە، کوشتنێکی بێدەنگ و لەسەرخۆ.
دانی پێدا دەنێم:
تاوانباران ئامانجی خۆیان پێکاوە.
هۆی سەرەکیی تێکچوونی تەندروستیم لە ساڵانی دواییدا ئەتککردنی جگەرگۆشەکانمە.
تاکە شتێک جێی ئومێد بێ، ئەوەیە، خەمخۆرانی پەیڤی کوردی و هەموو ئەوانەی ڕێزیان هەیە بۆ قەڵەمی خاکی و کەمبڕشتم ئەو دیوانە شەقوشڕانە، بەتایبەتی «دیوانی دوکتور عەبدوڵلا پەشێو»، بسووتێنن و ئەو کەسانەش تفباران بکەن کە چاپیان کردوون، یا بڵاویان دەکەنەوە.

* * *

لەمەولا بۆ خوێندنەوەی هەموو دیوانەکان تەنیا و تەنیا پشت بەم چاپە دەبەسترێ.
لەم چاپەدا هەموو هەڵەکان ڕاست کراونەتەوە.
بۆشاییی شوێنی سانسۆرکراو پڕ کراوەتەوە.
هەندێ شیعر، بەهۆی کاتی نووسینیانەوە، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک، لە دیوانێکەوە بۆ دیوانێک، جێگۆڕکێیان پێ کراوە. چەند شیعرێک، کە پێشتر لە بیر کرا بوون، بۆ یەکەمجار بڵاو دەکرێنەوە.
چەند شیعرێکی کۆنیش، کە لە ڕووی زمانەوە لاوازبوون، دەرهاوێژراون.
ڕەچاوکردنی زمانی ستاندارد (بە هەموو پێکهاتەکانیەوە) تاکە هۆی دەسکاری و دەرهاوێشتن بووە.
خۆشبەختانە، بەدرێژاییی ژیان شتێکم نەنووسیوە لە ڕووی ناوەرۆکەوە لێی پەشیمان بم.

* * *

شیعر، بۆ من:
عەشق و چارەنووسە، نەک پیشە.
میحرابە، نەک بازاڕ.
نانبرە، نەک نان‌دەر.
شیعر خاچێکی قورس بوو چارەنووس دای بە

کۆڵی خۆم و ئەو کەسانەشدا کە لێمەوە نێزیکن.
تاکە خەڵاتێک، کە لە ئەنجامی نووسیندا دەستم کەوتووە، خۆشەویستییە. تاکە ترسی عومریش، کە چرکە بە چرکە و هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵمدایە، لە دەستدانی ئەو خەڵاتەیە.
زۆر جار، کە نامەی ئازیزان دەخوێنمەوە، یا کاتێ، لە کۆڕێکی شیعرخوێندنەوەدا، بە زمانی ئاگر و گوڵ لەگەڵ یەکتردا دەدوێین، شەرم دامدەگرێ و دەشڵەژێم. وا دەزانم ئەوەی لەوانی وەردەگرم زۆر زێترە لەوەی پێیانی دەبەخشم. هەر واشە!
بۆیێ، لەگەڵ هەموو کوێرەوەری و نەهامەتییەکانیشدا، من بەختەوەرم.

عەبدوڵلا پەشێو
هێلسنکی - ٢١/١٠/ ٢٠٠٥

هەر ناڵە، وا لە بورجی جەلالا وەکوو هیلال
هەر ماهە، وا لە کونجی مەلالا لە ناڵ ئەچێ
حەمدی

# لە بیرت ناکەم

چۆن بۆم دەکرێ لە بیرت کەم؟
چۆن بۆم دەکرێ دڵگیرت کەم؟

چۆن لاپەڕەی پاکی سپی
- هی ڕابردووی شادی و کپی -

لوول بدەم و بیشارمەوە،
بەم دڵەی پڕ ئازارمەوە؟

هەر دوێنێ بوو، لێرانەدا،
هەر لەم شوێنە وێرانەدا،

بە ڕابواردن، بە لێومژین،
خەندەمان نا سەر لێوی ژین،

بێ ئازار و بێ پەرۆشی
کەوتینە خەو، خەوی خۆشی.

لەبەر ترسی هەناسەمان،
جۆشی دڵی پڕ تاسەمان،

دەست و پەنجەی خوای دڵداری
دەیدایێنێ بادەی بەختیاری.

سا چۆن دەبێ لە بیرت کەم؟
چۆن بۆم دەکرێ دڵگیرت کەم؟

* * *

هێشتا قاقای پێکەنینت،
چرپە و سکاڵای شیرینت،

لە بەرگوێم دەزرینگێنەوە،
هەروا دێن و نابڕێنەوە.

سا چۆن دەبێ لە بیرت کەم؟
چۆن بۆم دەکرێ دڵگیرت کەم؟

* * *

هێشتا بزەی سەر لێوەکەت،
هێشتا دڵکێشیی شێوەکەت،

هێشتا کوڵمی خوێنتێزاوت،
ئاخافتنی گۆشەی چاوت،

وەک تارمایی لەبەر چاون،
نەخشی سەر دڵی داماون،

سا چۆن دەبێ لە بیرت کەم؟
چۆن بۆم دەکرێ دڵگیرت کەم؟

١٩٦٥ ـ هەولێر

# زۆر لێت دوورم

زۆر لێت دوورم، ڕاستە، گیانە،
بەپەرۆشم، دڵ پڕ جۆشم،
جەستەم وەک چاو لە گریانە،
لەناو شارێکی خامۆشم.

لەسەر پەردەی تاریکی شەو
شێوەی جوانت دەنەخشێنم.
هەرگیز لە چاو ناکەوێ خەو:
دەیپەرستم، دەیدوێنم!

بەعقووبە ـ ١٩٦٥

## کیژۆڵەی دڵگیر

کیژۆڵەی دڵگیر، ئەی لەخۆبایی،
بۆچی دەمکوژیت بە ناڕەوایی؟

بۆچی دڵڕەقی بەرامبەر بە من،
کە بتپەرستم هەتاکوو مردن؟

دەزانم بۆچی دڵ پڕ لە قینی،
لە چەقی ڕێگەش هەرگیز نامبینی:

چونکە دڵپاک و وەفادارم بۆت
شەوانی تاریک بەئازارم بۆت

چونکە لاوێکم، ڕاستم، فێڵباز نیم
چونکە چاوباز نیم، بەقیز و ناز نیم

چونکە جل ڕەنگاوڕەنگی جادە نیم
چونکە قومارچی و فێری بادە نیم

چونکە نازانم، نە کەم و نە زۆر،
ڕووم مەکیاژ بکەم هەرڕۆژ بە سەدجۆر

چونکە هەژارم، خاوەن تەلار نیم
بەندەی سەربەرزیم، بەندەی دینار نیم

چونکە لەجیاتی دیاری یا سامان
پێشکەشم کردی دڵێک تا نەمان!

بەڵێ، تۆ بۆیە دڵ پڕ لە قینی،
لە چەقی ڕێگەش هەرگیز نامبینی!

١٩٦٥/٢/١٣ - هەولێر

## پەشیمانی

من هەڵە بووم.
لە ڕۆژانی جوانی و گەنجیم بە پەلە بووم.
هەر نەسرەوتم...
بە شوێن هەستێکی ون کەوتم...
تاکوو لەسەر سنگی نەرمی خەیاڵی پووچ
کپ بووم، خەوتم
ڕابرد گەنجی...
تاوێک نەمدی بەری ڕەنجی.

زۆر بەر دەرگەی نازدارێکم کوتایەوە،
تاکوو چڵی ژینی گەنجیم ڕووتایەوە.
ئەوسا مۆمی هەستی تەزیو،
بۆ ژیانی پرشنگ بەزیو،
داگیرسا، درەوشایەوە.
بۆی دەرخستم ڕێی سەرەوژوور،
ڕێگەی کۆشکی ئامانجی دوور...
بەڵام پاش چی؟!
پاش ئەوەی خەم گەرای دانا
لە دڵی شێت و مەستمدا،
هەرچی جوانی و ڕۆشنایی بوو،
سەد مخابن، لە دەستم دا.

١٩٦٥ ـ هەولێر

# کرێکارین

کرێکارین، کرێکارین
پەروەردەی ئێش و ئازارین
ئارەقڕێژین،
ژین دەنێژین
تاکوو بژین.

کرێکارین، کرێکارین
کۆڵەکەی ژینین، بەکارین

به هەڵمەتی بازوو و شانمان،
بە تەمەنی پڕ مەینەتی تێکۆشانمان
شاخوداخی پڕ مەترسی
بنکۆڵ دەکەین، جەرگ دەدڕین،
لە کیسەی تەمەنی خۆمان
نرخێکی تازەی بۆ دەکڕین...
بەڵام تووشی سەرسوڕمانین،
کە نازانین،
بۆ کێ دەچێ ڕەنجی بازوو
جگە لە نان، چەند لەتێک نان
- ماکی ژیان -
ئەمەش بۆچی ؟
تا بێینە گەڕ وەکوو ئامراز،
بێ قرەقڕ، نەمانبێ ڕاز،
جگە لە ڕەنج، جگە لە کار،
بۆ گیرفانی سەرمایەدار!

١٩٦٥ - هەولێر

# دۆن ژوان

ڕێک و جوانی، تۆ دۆن ژوانی.
سنگ دەرپەڕیو، چاو قەترانی!

هەنگاو بنێ، سووک خۆت بادە،
لەم جادەوە بۆ ئەو جادە

سەر شانە کە لەناو کۆڵان،
ئازای ناو کوڕی کیژۆڵان!

جل وەک بووکی ناو کەژاوەی،
یەخە بە مێخەک ڕازاوەی!

کەوشی تازەت چەشنی شالوور
لێی هەڵدەسێ ئاواز لە دوور

بۆ هەر جێیەک بچیت، بێ دەنگ،
دەتپەرستن کچانی شەنگ

سا چیت لە من، چیت لە حەمە،
کەوا دڵمان پڕ لە خەمە!

حاڵت باشە وا گڕەی دێ
گیرفانت گەرمە زڕەی دێ!

* * *

تف لەو بەژنە، لەو باڵایە،
لەو سەر و ملە والایە

تف لەو دڵە پڕ سستییە
کە هەر فێری ژێردەستییە

تف لە جوانیی ئەو دوو چاوە
کە بۆ چاوبازی خوڵقاوە ـ

نابینێ نیشتمانەکەی...
ئازاری خاکە جوانەکەی...

تف لەو گوێچکە، چەند سەگسارە!
چەند مووچە بۆ دەنگی پارە!

بەڵام دوورە لە بیستنی
کوردایەتی و پەرستنی

١٩٦٥ – هەولێر

# ئاواتێك

تۆخوا، گیانەکەم، لەگەڵ بەیان زوو
بمگەینە کۆشکی بەرزی ئارەزوو،

وەک پەیکەرێکی دەستکردی خوایی،
بمخەرە ژینی پڕ دڵنیایی:

وەرە بەر دەرگە بە چاوی پڕ خەو،
هەر بە پۆشاکی فریشتەییی شەو،

هەناسەیەکی بۆنخۆشی لێوان
بپرژێنە سەر پەڕەی گوڵی ژیان،

با بە یەک خەندەی پاکی بێ گرێ
مووچڕک دڵم وەکوو دیل بگرێ،

تا کپ کا داخی شەوی درێژم،
کە خوڕپەی دڵم بۆت هەڵدەڕێژم.

١/٩/١٩٦٥- هەولێر

## تابلۆی ژیانم

منم - ژیانی پڕ لە ناسۆری،
لە نیشتماندا، نێزیک و دووری،
کاری کردە سەر ناخی گیانم و
پەنجەی بردم بۆ خامەی جەسووری.

منم ـ لایلایەی هەژاری و ڕۆژگار،
ناڵەی دەورویشت، هەناسەی ئازار،
گوێچکەی تەمەنیان زرینگاندمەوە،
خستمیانە کار، بە هیوای بەهار.

منم ـ شەپۆلی ئازار و تاڵیم
خەندەی کوشت لەسەر لێوی منداڵیم،
بەڵام زۆر بیری بەرزی ژیانی
بەرەو دەماخی ساوا ڕاماڵیم.

منم ـ گەردانەی گەردنی خەیاڵ.
ساتێ فریشتەی جوانیم دێتە پاڵ،
تابلۆی هونەرم بۆ ساز دەکاتن،
دەمخاتە بزە و خولیای گڕوگاڵ

منم ـ سروشت و هونەر و جوانی،
ئاواز و هەڵبەست، نووزە و گۆرانی،
یەکە بە یەکە لێویان ماچ کردم،
منیش بۆم گوتن هەرچەندم توانی.

١٩٦٦/٦/١٨- هەولێر

## هەر بە دراوم #

هەر بە دراوم،
نەک بە گفتوگۆی نەرم و شەکراوم،
خوو و ڕەوشت بەرزیت سوپەری شکا،
ئەو ئاوە پاکەی پێت دەگوت ئابڕوو
بە جلی جوان و زێڕ و زیو تکا!

---

# هەڵبەستێکی نیزار قەببانییە بە دەسکارییەوە کراوەتە کوردی.

وەکوو کتکەکوێر،
هەوراز بە هەوراز،
هەڵدێر بە هەڵدێر،
بێ لێکدانەوە بە شوێنم کەوتی،
باوەڕت پێم کرد... هەرگیز نەسرەوتی.
دەزانی بە چی؟
هەر بە دراوم،
نەک بە گفتوگۆی نەرم و شەکراوم!

* * *

ئەمەتا سنگی وا شۆرشگێڕ و لەخۆباییبووت
ئەمەتان هەردوو گۆی مەمکەکانت،
وا لە دەست پەنجەم دەناڵن بە جووت!
گەنجینەی خۆمن...
کوانێ، نابینم قەت بەربەستم کەی،
دەربەدەرم کەی، زویر و پەستم کەی!

بەڵێ، تۆ ئێستا
زۆر گوێدێرتری بۆ پەنجەکانم لە ئەنگوستیلە.
ئەو لێوە ئاڵەی،
کە من سەردەمێک وەک خوا دەمپەرست،
وا بە دەستمەوە ئێستاکە دیلە.

* * *

باوەڕم هێنا کە ئەم جوانییە
بۆ گشت کەسێکە، هەر بۆ من نیە.
بۆیە دەیشێلم،
بۆ کەسێکی تر شیلەی ناهێڵم...
دەزانی بە چی؟
هەر بە دراوم،
نەک بە گفتوگۆی نەرم و شەکراوم!

* * *

وا بە سەر هەموو ئەندامی لەشتا

هەڵدەڕێژم قین،

قینێکی دێرین،

ئای هەژار، نەزان، چی لە دەست نایێ:

نە فیز، نە جنێو...

نە کینە، نە ناز...

یا خۆ هەرایێ!

هەر لەو ڕۆژەوە دیلم کردووە

هەر بە دراوم،

نەک بە گفتوگۆی نەرم و شەکراوم!

١٩٦٦- هەولێر

## پێکەنە!

پێکەنە بە من، بە باڵا و ڕەوتم،
بە ساویلکەییم، بە بیری چەوتم،
بە درەختەکەی خەیاڵی لاویم،
کە ساڵەهای ساڵ لە سایەی خەوتم
بەو دڵە مەستەی چاوی تۆی پەرست،
ئەو چاوانەی قەت بۆیان نەسرەوتم.

* * *

پێکەنە بە من هەتا دەتوانی!
بەڵێ! پێکەنە بە من، بە ژینم،
بە لەشی بێهێز،
بە هەردوو چاڵی چاوی بێتینم.

بەڵێ! پێکەنە...
بەو پێکەنینە
بە هاوتات ناشێ هیچ نازەنینێ.
من زویر نابم!
چاو ڕاهاتووە هەروا بتبینێ

* * *

پێکەنە، گیانە!
بەو دەور و دەمە پڕ ئێش و خەمەی
بە قرچەی گەرما،
بە سۆڵەی سەرما،

زۆر بە تاسەوە دەهاتمە سەر ڕێت،
وشەی دڵداریم دەچرپاندە گوێت.
هۆنراوەی تەڕم دەهۆنینەوە
بۆ دڵداریی تۆ،
بۆ بەختیاریی تۆ،
بۆ ڕووی وەک مانگت،
بۆ چاوەکانت،
بۆ پێڵووی مەست و برۆ و برژانگت.
هونەرمەندێک بووم، زۆر لەخۆبایی.
دەمویست تۆ بکەم
بە تابلۆیەکی ڕەنگینی خوایی.
لە دەوروپشتت دەسووڕامەوە بە دڵنیایی.
بە پەڕەمووچەی هەستی ناسکم
زۆر بە وردبینی نەخشم دەکردی،
سا بەرەو تەختی
فریشتەکانی بەهەشت دەمبردی!

* * *

بەڵێ، پێکەنە
کە هاتوچۆم کرد
لە بەردەم کۆشکی خنجیلەی زاوا،
تەماشام کردی زۆر بە ترسەوە
هەر بە گۆشەی چاو، ناچار..لەتاوا...

بەڵێ، نازەنین!
دەنگی خڕخاڵ و قاقای پێکەنین،
زڕەی سێ ڕستە گەردانەی زێڕین
بکە مۆسیقا و
پەردەی گوێچکەمی پێ بێنە گرین!

پێکەنە، گیانە!
بەو ڕۆژە ڕەشەی کە تێیدا ڕوا
گوڵی دڵداریی زوو بابردوومان؛
بە خەوی خۆشی ناو ئەو باوەشەی
دەگێڕێتەوە گشت ڕابردوومان.

* * *

پێکەنە بە ناز، ئەی نیهاد مردوو،
بە خەونی دوێنێی من و تۆ هەردوو،
بە هۆنراوەم و تاریی بیناییم،
بە هەناسەی سارد، ژینی تەنیاییم،
بە چەند وشەیەک، هێلانە سەر لێو،
شیرین، ئاگرین، کەم و هەست بزێو:
«پەرستگەی ڕووخاو، ئەی بووکی تازە،
ژینی نێو کۆشکت سەدجار پیرۆز بێ.
ئەو گەنجینەیەی کە ناوی نازە،
با بۆت هەوێنی ئەندێشە و سۆز بێ!»

١٩٦٦- هەولێر

# ئەی گوڵی زەرد

ئەی گوڵی زەرد،

ئەی گوڵی زەرد!

ئەگەرچی ڕەشەبای نامەرد

پەیتاپەیتا هەڵمەت دێنێ

لە چڵی ژین بتقرتێنێ،

لە ژێر پێیان تێر بتشێلێ،

بتئەنجنێ و هەر نەتهێڵێ،

تا ناکام بی و نەگەی بە کام.
سارێژ نەبێ لە دڵتا زام.
بەڵام، گیانە،
ئەی گوڵی زەرد،
بەرزهەڵچووی گەڵا بێگەرد:
تۆ هەر دەژیت...
ڕەگت هەیە لە دوورەشوێن.
گڕت هەیە
لەناو هەموو تنۆکێک خوێن.

* * *

ئەی گوڵی زەرد،
ئەی گوڵی زەرد!
وا هەزاران لاوی نەبەرد
دڵداری تۆن.
چاوەنواڕی بەهاری تۆن.

باوەڕی بەهێزیان پێتە.
ژینیان دادەنێن لە ڕێتا.
پۆلایینن،
زۆر بەهێزن،
بە هەر نرخێک دەتپارێزن.

* * *

ئەی گوڵی زەرد!
تاکو شەوە با ڕەشەبا
لابەلا بتهێنێ و بتبا...
بەڵام سبەی،
تیشکی بەیان
کە دەتبینێ
پەیامی پیرۆزت گەیاند،
هەڵتدەمژێ...ماچت دەکات...
باست بۆ هەر لایێک دەبات.

ئەوسا شالوور
بەجێدەهێڵێ ئاسۆی دوور،
بۆ لای تۆ دێ،
تا مەستانە بچریکێنێ،
ڕازەکانی مەردایەتیت بدرکێنێ،
گۆرانیی خۆش بڵێ بۆ تۆ، بۆ هەموو باخ،
بلەرزێنێ داوێنی شاخ:
«تۆ هەر دەژیت، ئەی گوڵی زەرد،
بەرز هەڵچووی گەڵا بێگەرد»

١٩٦٦- هەولێر

* * *

بمگره باوەش، هیوام، ئاواتم،
ئەو باوەشەی بۆم بێشکەی ئاواتە.
بملاوێنەوە تاکوو لە لاتم،
کە مەستیی ڕاستیم تەنیا ئەو ساتە!

* * *

# خاڵە پیرۆت

خاڵە پیرۆت، خاڵە پیرۆت!
بەسە، مەگری بۆ بەختی خۆت.

کاروانەکەمان نەبەزە،
کۆڵەکەی پشتی ڕەگەزە،

زرەی زەنگی پێشکەوتنە،
پەیامبەری سەرکەوتنە،

قەت ناچەمێ و نەچەمیوە،
لە کۆڕی ژین زۆری دیوە،

وەکوو گوڵی وەرزی بەهار
ڕوا لەسەر زبڵی ئازار،

ڕەگی داکوتا زۆر بەتین،
هەڵچوو بەرەو ئاسمانی شین.

* * *

خاڵە، باوەڕمان شەپۆلە،
شەپۆلی پڕ قین و تۆڵە،

پەیامی ڕاستیی ژیانە،
دژی فرمێسکی گریانە،

لە سەرچاوەی ئازارەوە،
لە هیوای لادێ و شارەوە،

له قوڵپی خوێنی زامەوە،
له حیبری نووکی خامەوە

پەیتاپەیتا هەڵقوڵاوە،
لەگەڵ ژیان تێکەڵاوە.

جموجۆڵی ئەو شەپۆلە
تێر ئاو دەکا هەردی تۆڵە.

هێزی زۆردار با گەورەش بێ،
جڵەوگری ئەم دەورەش بێ،

بڕوای ئێمە تێی دەئاڵێ،
بەرەو نەمان ڕایدەماڵێ!

چونکە هێزی مێژووی دووره
شۆرشە، دژی سنووره!

١٩٦٦- هەولێر

## وشەی پەردە

ئاغا گوتی:
من پەیکەری خوام کتومت،
دەبێ گشت لا
بمپەرستن هەر وەکوو بت!
ڕاستبوونەوە مۆسۆلینی و هیتلەر لە گۆڕ،
گوتیان: ڕاستە!
ئێمەش دوێنێ وامان دەگوت!

* * *

«بچێنە دەدووریەوە»
جاران پەندی وا هەبوو.
منیش لە زۆر هەردم چاند،
بە زبڵم بڕوا هەبوو
کەچی ئێستاش، داخەکەم،
قەت هیچم نەدووریەوە،
نە کەس گوتی ئافەرین،
نە پاداشت لای خوا هەبوو

١٩٦٦- هەولێر

## شەوەزەنگ

گیانە، وا شەو درەنگە.
زەمین کپ و بێدەنگە.
بەرپەنجەرەی ڕووناکت
بەرنادەم، شەوەزەنگە ـ

تاکوو نەتگرمە باوەش،
ئەی گوڵی ئاواتی گەش!

* * *

زۆر بە ئازارم ئەمشەو.
لە چاوانم دووره خەو.
بۆ خەوی باوەش هاتووم،
بۆیە، گرەو بێ... گرەو ـ

واز نەهێنم، دیدەگەش،
تا تێر نەتگرمە باوەش!

* * *

وەره دڵ پڕ نەوا بین،
لەژێر پەردەی شەوا بین،
لە چۆڵی خەم هەڵفڕین،
مەستی جوانیی دنیا بین ـ

تەنیا دەمێ، دیدەگەش،
یەکتر بگرینە باوەش!

* * *

ڤینۆسم، خواوەندەکەم،
بژیێنەوە خەندەکەم!
ژینم فیدای ئەو ساتەی
دەشکێنی پێوەندەکەم -

بە سکاڵای دیدەی گەش،
بە چرپەچرپی باوەش!

* * *

شەوقی نزمی ئەستێرە
سەما دەکا بۆ ئێرە،
بە خەندەی پڕ بەزەیی
چاو هەڵناگرێ لێرە -

تا من و تۆی دیدەگەش،
یەکتر نەگرینە باوەش!

١٩٦٦ - هەولێر

* * *

گیانە، گەر جارجار... ناچار، لەتاوا،
ئەسرم قەتیس ما لە گۆشەی چاوا
بملاوێنەوە سەر لەسەر ڕانت،
کپ دەبمەوە بۆت وەک کۆرپەی ساوا!

* * *

# دڵداریی بێدەنگ

دوو دڵدارین کپ و بێدەنگ.

دوو زامدارین، ژین شەوەزەنگ.

لە ئاسمانی خەیاڵی تەڕ دێینە فڕین

بێ سکاڵا، بێ ڕاز و نیاز دەربڕین.

بەڵام خۆشە!

ئەو دڵە چۆڵەی خامۆش بوو،

دوور لە جۆش بوو،

ئێستا پڕە لە ئاوازی
دەنگی سازی
خۆشەویستی،
خۆشەویستیی کەس نەبیستی،
کە لە ئەسری شەوگاری چاو
پێشکەشم کرد، هەرچەند ویستی.

بەڵێ خۆشە!
با ڕامماڵێ
لێشاوی ئەندێشەی بێبن،
هەڵمگرێ و بمباتە لای
ئەو خواوەندەی جوان و شەرمن،
کە دەمێکە ڕادەبوێرین بێ گفتوگۆ،
قووتمان دەدا گەرووی تەنگی
ژینی ژانی شەوەزەنگی،
بەبێدەنگی!

* * *

لە چوارچێوەی دڵی لاودا
شێوەی جوانی یەکتریمان هەڵواسیوە.
لە ئاوێنەی ڕوونی چاودا
دڵی یەکمان چاک ناسیوە.
چۆن نەیناسم؟ چۆن نەمناسێ؟
هەموو جارێ کە پێک دەگەین
زمان لە زاردا دەتاسێ.
لەگەڵ دڵەکوتەی گەرم،
لە ڕوومەتمان تک تک دەتکێ
ئارەقەی بێگەردی شەرم.
ختووکەی پەنجەی ئارەزوو
دەمانخاتە بەر لێشاوی سیحری تەزوو.
بیناییمان، کە فرمێسک دەیدوێنێ،
دەستێکی خوایی نهێنی
پەردەی بە سەردا دەکشێنێ،
هیچ نابینێ.

١٩٦٦ ـ هەولێر

## بمبووره

بمبووره ئەی کچ، بمبووره،
ئەو ڕێگایەی
ویستم بە ئاهەنگ بیبڕم
یەکجار دووره،
بێ سنووره.
بمبووره، هێشتا منالّ بووم،
کرچوکالّ بووم،

بە لالانەوەی ڕەنگاوڕەنگ
دنیام بۆ تۆ کردە ئاهەنگ.
بەڵێ، بمبوورە ، خۆشەویست،
ئەوەی ڕوویدا من وام نەویست.
بێ گوناهم،
وایان پێم گوت دەوروپشتم...
هەستپاکییان لە دڵ کوشتم.
گوتیان وایە،
خۆشەویستی بەس سەمایە!
ماچکردنی لێوی ئاڵە،
یا گوشینی سینەی کاڵە،
مووچڕکی دەست لە ملانە،
ڕابواردنی ناو گوڵانە،
دڵگیربوونە، ڕۆیشتنە،
ئاشتبوونەوە و گەیشتنە،
خۆکوشتنە، خوێنڕشتنە،
تەوەزەلی و پاڵکەوتنە،
نەخەوتنە.

ئێستاش، گیانە،
چەند ئازار و خەم دەچێژم،
چەند ئەسری بەکوڵ دەڕێژم،
کە پێم دەڵێی:
«کوا، هیوامان نەهاتە جێ؟»
بەڵام چبکەم، چیم لە دەست دێ؟!

١٩٦٦ ـ هەولێر

# جوانیی ئەفسووناوی#

هەموو شتێک جوانە لە تۆ:

نازکردن، تاسە، گفتوگۆ،

بەڵێندان، سەردان، هاتوچۆ.

چەندە جوانە

شەپۆلی پێکەنینی ناز،

کە ختووکەی گیانم دەدا بە سەد ئاواز،

لایلایەیە بۆ خەوتنم
لە باوەشی گەرمی مراز.

ئای، چەند جوانە
ڕەوتت بەرەو قوتابخانە.
بە هەنگاوی وردیلەی سووک،
وەک پەپوولە لەنجە بکات
بۆ ماچێکی لێوی گوڵووک.

* * *

هەموو شتێک جوانە لە تۆ:
سۆزی گەرم،
بزەی نەرم،
دڵتەڕیت و چێژی ناسک،
جارجار چرپەی تێکەڵ شەرم.

چەندە جوانە:
پەنجەی لەخۆوە نەرم و شل،
تاڤگە کەزیی ئارمووشینی
پەخش و خاوی سەر شان و مل.

چەندە جوانە:
قژی تەنکی سەر ناوچەوان،
کە وەکوو تەم سەما دەکا
لەسەر بەفر و گوڵ ئەرخەوان.

* * *

هەموو شتێک جوانە لە تۆ:
وردە نیگا،
چاو و برۆ،
گێڕانەوەی بیرەوەریت،
باسی خۆشی و دەردەسەریت،

باسی دەستەخوشکانی خۆت،

باسی شیعری بێ تام و بۆت،

باسی دوارۆژ،

باسی ناوماڵ،

باسی ناوی یەکەم مناڵ!

١٩٦٦ - هەولێر

---

# کاتی خۆی بەشی یەکەمی ئەم هۆنراوەیە لە دیوانی (فرمێسک و زام)دا بڵاو کرایەوە، هی دووەمیش لە (بتی شکاو) دا.

# بڕیار

بڕیار بوو پێشێل بکەم دڵداریت
بپچڕێنم ژێی سۆزی یادگاریت

تا تێکەڵ گیانی یەزدان نەبمەوە
بۆ نێو پەرستگەی چاوت نەچمەوە

بڕیار بوو کەوا ئاگرێکی خۆش
پەیامەکانت گشت بگرێتە کۆش

بەڵام تنۆکە فرمێسکی ئەمڕۆت
وای کرد گۆرانی بڵێمەوە بۆت

لە جاران پتر بەندەی جوانیت بم
شاعیری بزەی کامەرانیت بم

١٩٦٦ ـ هەولێر

## یاری دڵسۆزم

گیانە، هەژاری، دۆستی دڵسۆزم،
تەونی تەنیایی بیری پڕ سۆزم،

ئەی ئەو نازدارەی ساڵەهای ساڵە
تەنیا و دەست لەمل دەژین لەم ماڵە:

زۆر تۆم خۆشدەوێ، قەت جێم مەهێڵە،
ژینم بە پەنجەی ناسک بشێلە،

چونکە کام هەڤاڵ، کام دڵداری تاک،
کام دایک و باوک، کام برای شیرپاک،

هێندە وەکوو تۆ دڵسۆزە بۆ من،
دەم لەناو دەمە و دەست لەسەر گەردن!

١٩٦٧ ـ هەولێر

# هۆنراوەم

هۆنراوەم  شیلەی دڵ و دەروونمە،
ئاوێنەی ژین و بوون و نەبوونمە،

سرووودی گەرمی تافی لاویمە،
هەڵچوونی خوێنی ئاگراویمە،

بۆیە جیاوازیی نییە، ئەی جوانم،
منت خۆش بوێ یا شیعرەکانم.

١٩٦٧ ـ هەولێر

# کچ و شایی

شایی دەکا...
پێی لەسەر دڵ شایی دەکا.
لە سووکیدا
لە پەپوولەی ناو بەهەشتی
خوایی دەکا.

* * *

سنگی تازە پێگەییوی،

هیچ نەدیوی،

هەڵدەپەڕێ.

چاوەنوارە

تا نیگای چاوی دڵتەڕێ

شوێنی کەوێ...

بۆی نەسرەوێ.

* * *

ئەو گەردنەی کە پڕشنگی

کەوتۆتە شەڕ

لەگەڵ خشڵی خۆی و سنگی،

وەک تروسکەی خواپەرستی

شەپۆلی دا، خلیسکی برد،

ناخی دڵمی لە باوەش کرد.

ڕستەکانی گەردانەی زێڕ
وەکوو منداڵێکن شەرمن
لەهیکرا هەڵدەقۆزنەوە و
نیگای چاوێک دەبڕنە من!
سا بە تاسەی کۆرپەی برسی،
بۆ مژێکی نەومەمیلە،
دەکەونەوە و چەپۆک دەدەن
لەو جێگایەی دڵ بۆی دیلە!

١٩٦٧ ـ هەولێر

## بتی شکاو

بتێک بووی دەسکردی خۆم،
کڕنووشم بۆ دەبردی،
لە ساتی تەنیاییمدا
سکاڵام بۆ دەکردی.

بەڵام، ئەمڕۆ لە دەورت
کۆمەڵی کڕنووشبەران
تفری نەخشی پیرۆزی
پەنجەی منیان هەڵوەران؛

شێلایان ئەو شۆخییەی
جێی سەرنج بوو بۆ هەڵبەست
ژەنگیان خستە ئەو دڵەی
پرد بوو بۆ ژێر پێی مەبەست.

کەوابێ، تۆ دارِشتەی
دەستم بی و بۆ من نەبیت،
ئیتر بۆچی لە ژێر پێم
ئەنجن بە ئەنجن نەبیت؟!

١٩٦٧ ـ هەولێر

# نامەی ژاکاو

ئەی ئاوازی
ساتی هۆنینەوەی هەڵبەست،
بەستە و سازی
ئەو شەوانەی دەژیم سەرمەست:
چیت زانیوە، وا بە جارێ لەخۆبابیت؟
بۆ، وەک جاران،
خەمڵیو نەبوو نامەی دواییت؟

تێیدا نەبوو
ئەندێشەیەک، بیرێکی ورد،
بۆنێکی خۆش،
یا نەخشێکی جوانی دەستکرد؟

وشەکانت گشت سارد و سڕ،
ڕستەکانت پچڕ پچڕ،
چەند بۆ ناخیان، ئەوپەڕی ناخ،
قووڵ چووم، خشیم،
هیچ مووچڕک و
هیچ هەستێکیان پێ نەبەخشیم

* * *

خۆشەویستم!
من دەمەوێ وشەکانت
بکەنەوە شانۆی هەستم،

ببزوێنن دڵی مەستم،
بتکێن وەکوو دڵۆپەشیر
بۆ لێوی کۆرپەی هەڵبەستم.
من دەمەوێ
وشەکانت
تەڕوبڕ بن وەک دڵی من،
پڕ تەوژمی ژین بن وەک خۆت،
گەرم بن وەک لێوی گۆشتن،
تەزوودەر بن وەک گفتوگۆت.

١٩٦٧ ـ هەولێر

## مافی خۆته

چۆنت پێخۆشە، بە ئارەزووی خۆت،
لەت کە ئەو دڵەی شادیی دەوێ بۆت.

لە چەقی ڕێگەم، هەر لە بەرچاوم،
بنێ ژێر پێیان نامەی پێچراوم.

شان بە شان بڕۆ، قشتیلە و نازدار،
لەگەڵ دۆستێکی تازەی پارەدار.

ئەو دۆستەی کەوا ناو لە زارانە،
هەر هی تۆ نییە و هی هەزارانە!

بیلاوێنەوە، تێر بۆی پێکەنە،
لە دڵما نەخشی یادگار هەڵکەنە.

قەیناکا، گیانە، مافی خۆتە خۆ،
ئەو ڕەفتار دەکا بە ئارەزووی تۆ.

بێبەشت ناکات لە شێلانی لەش،
لە سکاڵای زۆر، وەنەوزەی باوەش.

قەیناکا، گیانە! ڕاستی، زۆر ڕاستی،
پێم نەهاتە جێ چی دڵت خواستی!

تەنیا شیعر بوو ئەوەی من هەمبوو،
بۆ قنیاتی تۆش شیعر زۆر کەم بوو!

١٩٦٧ ـ هەولێر

# کێوی باوەڕ

با تریشقە بێ، با برووسکە بێ،
ئاسمانی ژینم بێ ترووسکە بێ،

با دەوروپشتم گرمە و گاڵە بێ،
با دیمەنی خوێن بۆم گوڵاڵە بێ -

پەیمانم داوە بە زنجیرەی کێو،
کە تیشکی خۆری نێزیکە لە لێو،

گەر ڕەهێڵە بێ و بەردیش بباریٚ،
لە کێوی باوەڕ نایێمە خواریٚ.

١٩٦٧ ـ هەولێر

## ڕێڕەوم

«سروودی منداڵە شەهیدێکە»

لە بەندیخانەی تاریک و نووتەک،

گوێ پڕ لە دەنگی کەلەپچەی مەچەک،

پڕ بە ناخی دڵ،

زۆر گەرم و بەکوڵ،

گەر بتلێمەوەش

بەستەی ڕزگاری

هەر دەڵێمەوە دژی زۆرداری.

* * *

هەروا لە بیرمە،

دایکی نیشتمان

کاتێ نایە دەم گۆپکەی مەمکی ژیان،

چرپاندییە گوێم، بە سۆز، بە گریان:

«چەند ساڵە، ڕۆڵە،

لەم خاک و خۆڵە

دێ دەنگی زیلی

پڕ ترسی دیلی.

بۆ تۆڵە گۆش بە. نەک بۆ زەلیلی»

* * *

ناچێ لە بیرم،

کە باوکی ژیرم

چەکی مەردانەی خستە سەر شانی ...

ئێمەی بەجێهێشت بۆ تێکۆشانی،

نەیگێڕایەوە ئەشکەنجە و سزا،
تا ڕۆژێک ئاگر بە دڵیا چزا.
بەڵام هەمیشە دوا قسەی پەندە،
ساتێ پێی گوتم دەم پڕ لە خەندە:
« ڕۆڵە، مەرد بژی، نەک وەکوو بەندە »

۱۹٦۷ ـ هەولێر

# هەستێکی بریندار

گوڵی یەخان،
ژاکاوی گوڵدانی دوێنێ!
بەسە، چیتر... هەنیسکی تۆ نامبزوێنێ.
دڵداریمان
ئیتر بەس بێ و ببڕێتەوە،
یادگاریمان
لە تابلۆی یاد بسڕێتەوە.

با بژاکێ،
با بچەمێ
گەردنی شەستپەڕی دوارۆژ،
کە سەردەمێ
زۆر بە ئاوات بووم بیگەمێ.

١٩٦٧ ـ هەولێر

## پێم نەگوتی!

ئەی خوێنشیرین،

گەنجینەی منی ئاوارە!

دووری دوورتر لە ئەندێشەم،

لە سپێدەی هەندێ شەوان؛

ئەی بۆ چاوم پێڵوو و برژانگ،

ئەی نێزیکتر بۆم لە ڕەوان:

لەو ساتەوە ون بوو بالآت،
دڵی ڕەهام بەدواتا هات،
هات، خۆی ئاڵاند لە گۆزینگت،
سەد گۆرانی و سەد بەستەی گوت
بۆ مەلی ناو ڕکەی سنگت.

* * *

ئەی چاوگەی هۆنراوەی پەتی!
تاوانم کرد پێم نەگوتی:
من ئاوارە و هەژارێکم،
شاعیری دوورەشارێکم.
تاوانم کرد، پێم نەگوتی،
بەیانی زوو کۆتاییی دێ بەهارەکەم.
بە لەتێک دڵ دەگەڕێمەوە شارەکەم!
تاوانم کرد، پێم نەگوتی
دڵداریمان ـ

کورتەڕێ بوو، زوو بڕیمان؛
زیندەخەو بوو، بە ڕۆژ دیمان؛
بڕایەوە و هەر زامی ما.
ناکامی ما.
سەرسامی ما.
وا ئەوانیش بوون بە هەوێن
بۆ ئەم هۆنراوەی خەمڕەوێن!

١٩٦٨/٧/١٤ ـ بەغدا

## باسم بکەن

باسم بکەن، تا دەتوانن باسم بکەن.
دووڕووانیش با بێنە لام کاسم بکەن:

من بەزیوم، ناشاعیرم، گۆشەگیرم؛
هەلپەرستم، خۆپەرستم، تەسکە بیرم!

باسم بکەن، تا کاژێرتان لێک دەترازێ...
گەر شەو نەبێ، ڕۆژ چی هەیە پێی بنازێ؟!

شالاو بێنن،
سەری خۆتان بدەن لە کێو،
بگرن وەکوو کورتەبالا داوێنی دێو.

باسم بکەن،
کۆڕببەستن، باسم بکەن.
باسم بکەن،
هەڵببەستن، باسم بکەن.

بەڵکوو ناوم وەکوو هالاو، بە ئازایی،
هەڵسێ لەسەر گڕی قینتان بۆ بەرزایی.

١٩٦٨ ـ هەولێر

# بۆ خوای خەوتن

ئەی خوای خەوتن،
وا شەو هات، شەو!
پێشکەشم کە وچانێک خەو.
یا هەر نەبێ، تەنیا ساتێ،
مێشکم سڕ کە، بیدەرێ بەنگ...
گەر نەشخەوێ،
لە کار کەوێ وەک هی دەبەنگ!

ئەی خوای خەوتن!
وا دوو ساڵە نوێژ دەکەم، هانا دێنم،
ئەژنۆم لەژێر پێیانی تۆ دەچەمێنم،
تاکوو ساتێک بیر و هۆشم لە کار بخەی،
ئۆقرە بگرم،
پێڵوو داخەم،
بڵێم: ئۆخەی!

* * *

ئەی خوای خەوتن!
وەک دەبینیت:
نەوتەمەنم، تین و تاوم،
خوێنی گەرم و ماسوولکەی لەش،
شیلەی دڵ و پرشەی چاوم
وا خەریکی ماڵئاوایین
لە ئێسقان و پێستی ماوم!

دە ئێستاکەش،

نەچووە و بچێ، هێشتاکە هەم،

خوێنم گەرمە و ئاسۆی هیوا بەدی دەکەم.

کەوابێ... ها... نیوەی ژینم لێ بسێنە،

تەنیا ساتێک دڵنیام کە، بمخەوێنە.

* * *

ئەی خوای خەوتن!

جڵەوگری تەنسرەوتن،

دەنگ بنێرە بۆ من، هەمووم،

بڵێ: ئەی لەش،

دە بسرەوە،

دەمی خەوە.

بڵێ: پێڵوو،

خاو بە، بنوو.

بڵێ: ئەی یاد،

بپێچەوە بیرەوەری،
بیرەوەریی ڕۆژانی خۆش لە گەڵ پەری.–
بڵێ: ئەی سۆز،
ئەندێشەکەی تەلیسماوی، بیری ڕەوان،
بڕۆن... هەموو
دەست کەنە مل فریشتەکەی شیعری شەوان.
بەجێی بێڵن تەنیا ئەمشەو،
بۆ ساتێک خەو!

١٩٦٨ ـ هەولێر

دە ئێستاکەش،

نەچووە و بچێ، هێشتاکە هەم،

خوێنم گەرمە و ئاسۆی هیوا بەدی دەکەم.

کەوابێ... ها... نیوەی ژینم لێ بسێنە،

تەنیا ساتێک دڵنیام کە، بمخەوێنە.

* * *

ئەی خوای خەوتن!

جڵەوگری تەنسرەوتن،

دەنگ بنێرە بۆ من، هەمووم،

بڵێ: ئەی لەش،

دە بسرەوە،

دەمی خەوە.

بڵێ: پێڵوو،

خاو بە، بنوو.

بڵێ: ئەی یاد،

بپێچەوە بیرەوەری،
بیرەوەریی ڕۆژانی خۆش لە گەڵ پەری.-
بڵێ: ئەی سۆز،
ئەندێشەکەی تەلیسماوی، بیری ڕەوان،
برۆن... هەموو
دەست کەنە مل فریشتەکەی شیعری شەوان.
بەجێی بێڵن تەنیا ئەمشەو،
بۆ ساتێک خەو!

١٩٦٨ ـ هەولێر

# کۆتاییی چیرۆکێك

خۆشەویستەکەم!

ڕاستە، حەز دەکەم،

سالانی تەمەن،

چرکە بە چرکە هەر لە تەکت بم.

لەجیاتی کۆرپەی خوێنشیرین وەک خۆت

من پەنجەمژی سەر مەچەکت بم.

ڕاستە، حەز دەکەم
لە نێزیک چاوت
دڵی هەڵبەستم لە خورپەدا بێ.
هەر دیاری و نامە بگۆڕینەوە،
وەکوو لە ژینمان هیچ ڕووی نەدابێ.

ڕاستە، حەز دەکەم
پەپوولەی نیگام هەموو ڕۆژ بفڕێ،
تا لە هەلێکا
درزی پەنجەرە یا دەرگە ببڕێ،
ماچێک لە نیگای چاوت بسێنێ،
تینوێتیی گەرووی دڵم بشکێنێ.
بەڵام، گیانەکەم،
تاکە یادگارم!
ناچارم... ناچار کە تۆ لە یاد کەم.
لە ژێر دارکاریی ویژدانی هارم
بدەسێمەوە و زوو خۆم ئازاد کەم.

ناچارم، دەبێ گۆڕێک هەڵکەنم
بۆ هەر یادگارێک بۆنی تۆی لێ بێ.
دەبێ گوێم کەڕ کەم،
زمانم لاڵ کەم،
لەلای هەر کەسێک باسی تۆی پێ بێ!

دەبێ هەر ئەمڕۆ
وێنەی دووقۆڵی و نامەی بە دەرزن
لە گەرووی گڕدا ببنە خۆڵەمێش،
هەرچەند لە ناخی دڵمدا بەرزن.

دەبێ، هەر ئەمڕۆ،
بمرێ لە یادم دڵکێشترین چاو.
بمرێ لە یادم
ناسکترین دەنگ، شیرینترین ناو.

دەبێ هەر ئەمڕۆ
بڕووخێ لە یاد پەیکەری باڵا.
سڕ بێت لەسەر زار
ئاگرینترین وشەی سکاڵا.

* * *

ئەو سنگە نەرمەی کاڵ و گۆشتن بوو،
بەهەشتی مەلی ئارەزووی من بوو،
ئەمڕۆ تاوانە، نە زۆر و نە کەم،
وەک گەنجینەی خۆم پەنجەی بۆ ببەم:
چونکە بێگانەم، تۆ بەهەڵە چووی،
هی پیاوەکەتە و کۆرپەی تازەبووی!

ئەو قژە ڕەشەی
کە پار و پێرار
بۆنی سەرمەستی دەکردم جارجار،

ببوو بە داڵدەی
چاوی شەرماویم،
ڕەنگی پەڕیوم، لێوانی بە بار،
ئەمڕۆ دەبێ دڵ ئەویش لە بیر کا،
تا تەنیا کۆرپەت دەستی لێ گیر کا!

١٩٦٨ ـ هەولێر

## گۆڕێك بۆ دوێنێ

پاش تەمەنێک ئێش و ئازار
پاش ناکامی و جەوری ڕۆژگار

پاش تۆرانم لە یادگاریم
لە تەمەنی نەوبەهاریم

لە بزەی لێو، لە خەونی دڵ،
لە بەرامە و لە ڕەنگی گوڵ ـ

گەڕامەوە بۆ پێکەنین،
بۆ ڕووناکی، بۆ خۆشیی ژین،

بۆ چیمەنێک لە بەهاردا،
بۆ دیمەنێک لە گوڵزاردا،

بۆ جووکەیێکی ناخی مەل،
بۆ بزەیێکی لێوی کەل.

گەڕامەوە بۆ جوانی،
بۆ سروشت و کامەرانی،

بۆ ورشەیەکی نێو چەمان،
بۆ ئاوازێکی ژێی کەمان،

بۆ ئەستێرەی بە شنەشن،
کە لەژێر پێی خوادا پەخشن.

گەڕامەوە جارێکی تر،
بۆ باوەشی یارێکی تر،

گەڕامەوە بۆ تەمەنێ،
بۆی پێکەنم، بۆم پێکەنێ.

گەڕامەوە بۆ کۆششم،
بۆ دەروونی پڕ شۆرشم،

گەڕامەوە بۆ خامەکەم،
بۆ پەخشی بۆ و بەرامەکەم،

بۆ شەوانی ئەندێشاویم،
بۆ پەیکەری هیوای لاویم.

گەڕامەوە بۆ دڵڵێدان
لە پەرستگەی پاکی یەزدان،

تا بە دڵی پڕ لە بڕوا
چاو ببڕمە ناولەپی خوا،

بەڵکوو سرووش گیانم پڕ کا
سەدای ژینی پێشووم کڕ کا.

١٩٦٨ ـ هەولێر

# بۆ مارتنی مرۆڤ #

ئەی لوتەر کینگ،
ڕەشی گزنگ!
شوورەی ئاشتی و برایەتی،
دەروون کانگای ئازایەتی،
پەیامبەری پێستڕەشەکان،
پارێزەری بێبەشەکان:

تۆ کوژرای زوو
تاوانیشت هەر ئەوە بوو،
گوتت: دەبێ... دەبێ لە ژین
بە یەکسانی هەموو بژین.

* * *

ئەی لوتەر کینگ!
بە سەربەستی ژینت دەویست
بۆ ئادەمزاد،
نەک هەر تەنیا بۆ ڕەنگی پیست!
چەکی شەڕت
هەر بزە بوو، بزەی نەمر،
نەک هەر باروت، ئاسن، ئاگر!

* * *

ئەی لوتەر کینگ،
ڕەشی گزنگ!
وا تێ مەگە، بۆیە لە ژین وا بێبەش بووی،
چونکە ڕەش بووی!
پێڵووی داخراو ببزوێنە،
سەرەنجم دە،
لەگەڵ ئەوەی پێستەکەشم بەفر و خوێنە،
هەر لەتێکم ئاوارەی ژێر ئاسمانێکە -
گەنجینەی بێ سەروشوێنە.

سەرەنجم دە،
منیش وەک تۆ،
خۆری شادی،
هی ئازادی،
وڵاتەکەم پێ نازانێ.
دەچمە دەریای ئارەقە و خوێن،
دەست ناکەوێ پارچە نانێ.

* * *

ئەی لوتەر کینگ،

ئەی سروودی ئاشتی و برایی.

ئەم زەمینەی جێی تاوانە

ئێوەی ناوێ تا کۆتایی.

ئەم زەمینەی بە خوێن تژی

هاوار دەکا:

نابێ دڵی گاندی و مەسیح لێرە بژی!

ئەم زەمینەی جێی تاوانە،

هاوار دەکا:

دەبێ گریان، ئەسرینی چاو،

دووکەڵ، گرمە، دیمەنی شەڕ،

بۆنی باڕووت، قرچەی هەناو،

نووزەی مناڵ، دیلی و لاتی

باو بن وەکوو تیشکی هەتاو!

ئەم زەمینە هاوار دەکا،
هاوار دەکا ئەم زەمینە:
ژیان لای من
هەر زۆرانە و هەر جەنگینە.
هاوار دەکات:
دەبێ بسرەوێ لە لێدان
دڵی ئاشتی و خۆشەویستی،
دڵی یەزدان!

١٩٦٨ ـ هەولێر

---

# مارتن لوتەر کینگ (١٩٢٩ ـ ١٩٦٨): مافپارێزی قولەڕەشەکانی ئەمەریکا لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە. لە ١٩٦٤دا خەڵاتی نۆبلی بۆ ئاشتی وەرگرت و لە ١٩٦٨دا کوژرا.

# بۆ کچێکی کاڵ

لە دوورەوە ناوت بیستووم،
ناشارەزا خۆشت ویستووم!
گوایە لەگەڵ شیعرەکانما زۆر ژیاوی...
شەوەهای شەو
تەزووی شیرینیان پێ داوی.

نەتناسیوم!

بڕوا بکە نەتناسیوم...

ئەو جیهانەی تۆ دەتەوێ

هەرگیز لای من دەست ناکەوێ.

جیهانی من هەمووی خەمە

زەردەخەنەی ئێجگار کەمە

تەلاری من کەلاوەیە

جێی پەڕتووک و هۆنراوەیە.

ئەوەی ڕووگەی دڵ و چاوە

تەنیا بتێکی شکاوە!

* * *

دوور بە لە من،

لە ژینی من،

لە چاوانی بەدبینی من.

دوور بە لە من، لە هەڵبەستم،

لەو چەپکانەی

بۆ شاچەپکێک دەیانبەستم

٢٨/١٠/١٩٦٨ هەولێر

# لەگەڵما بە

گیانەکەم! گەر ژینت دەوێ لەگەڵ منا،
گەر دەتەوێ دەست لانەچێ لە گەردنا:

لەگەڵما بە، با هەر پشتم پێت ئەستوور بێ
لە بەهاری ژینی شادی و لە مردنا

لەگەڵما بە گەر هاتو ڕۆژێک لە ڕۆژان
بوو بە تانە تفم لە چاوی دوژمنا

لەگەڵما بە گەر پەتی سێدارە گوتی:
«کڕنووش بەرە، ناتخنکێنم» قیژاندم:«نا!»

* * *

لەگەڵما بە لە پیادەییم ڕووەو ئاسۆ،
لە بێداری و لە ئارەقەی ڕەش ڕشتنا

لەگەڵما بە، پێکڕا بچین خۆر دەربێنین،
با نەخنکێ لە گۆمی هەوری چڵکنا!

ئەو ڕۆژە چوو کە بتچێنم... بۆ ئەوەی شەو
بتدوورمەوە لەناو پێخەفی نووستنا!

* * *

لەگەڵما بە، خۆ تا ئەمڕۆ لەگەڵما بووی
لە پێمەلەی دەریای ئازاری بێ بنا

لەگەڵما بە، سوێندیش دەخۆم گەر ماندوو بیت
یا کۆڵ بدەی لە ڕووی هەوراز سەرکەوتنا،

جێت دەهێڵم، دەست هەڵدەگرم لە گەردنت،
من چۆن کاروان جێ دەهێڵم لە ڕێی ژنا!

٤/٥/١٩٦٩ ـ هەولێر

# پێناکەنم

پێناکەنم...
تا ئەو ڕۆژەی هەژارەکان
مامزی خەندە ڕاو دەکەن
بۆ لێوی لادێ و شارەکان.
کە ئەوەم دی،
ئەوسا منیش وەکوو ئەوان،

وەکوو شنەی گوڵەگەنم،
وەکوو ئارەقەی ناوچەوان،
لە ناخەوە پێدەکەنم.

* * *

پێناکەنم...
پێکەنینم هەرگیز نایێ
تا بە چاوی خۆم نەبینم،
لە هەر لایێ،
لافاوی ئاگرپژێنی چەوساوەکان،
ڕاستبوونەوە و یاخیبوونی
دیل و ئەژنۆچەماوەکان
دەپچڕێنێ کۆت و زنجیر،
ڕادەماڵێ
گەنجینەی خواپێداوەکان.

که ئەوەم دی
ئەوسا منیش، گەرم، بەتاو،
بەستە دەڵێم،
پێدەکەنم
لەدیار کۆت و بەندی شکاو.

١٩٦٩ ـ کوردستان

# کاڵ

پێش ئەوەی بێمە بەردەمت
کام بیری جوان خورپەدارە،
کام دێڕ هەڵبەست زۆر بەکارە،
شانەی دەکەم وەک پەرچەمت.
لە ماوەی چاوقوچانێکدا
هەزارویەک خەونی شیرین
دەمکەن بە مەم، دەتکەن بە زین.

لە خەیاڵما
پاییز بەهاری لێ دەتکێ.
درەختی ڕووت
گەڵای سەوزی پێوە دەلکێ.
بەڵام، سەد ئاخ، ئەی دەروونپاک،
کاتێ بانگم دەکەی بە ( کاک )،
کاک وەکوو مار
بەرەو گوێچکەم گینگڵ دەدا...
کە دێمە گۆ
خۆی لە زمانم لوول دەدا،
هێدی... هێدی...
قووتم دەدا
کفنی زەردی نائومێدی.

* * *

من لە دڵتام...
لە دەروونتام...

له گلێنەی چاوی ڕوونتام...
شەرم مەکە!
بە ناوی ڕووت
ناوم بێنە پڕ بە گەرووت.
با لە یەکتر ئاشکرا بین
تا کەی لەناو ئاگرا بین؟
نە تۆ خوشکەی، نە من کاکم...
خۆشەویستی دەروونپاکم!

٥/٦/١٩٦٩ ـ کوردستان

# له بەر دەرگە

شەو ڕاشکا،
ئەژنۆم شل بوو،
مانگ بە تاقی ئاسمانەوە هەڵپڕووکا.
دەرگەکەتم لێ بکەوە!
ئەم شەو هاتووم

بۆ چنینی
چەپکە نێرگزێکی چاوت،
بۆ وچانێ،
بۆ خەونێ، تۆزە گریانێ،
لەسەر هەوری قژی خاوت.

* * *

ئەم شەو هاتووم...
ترووسکاییی شاری یادگار بانگی کردووم.
لەگەڵ سیمای منالیما،
لەگەڵ خەمی شۆڕەبیما،
هاتووم و ناگەڕێمەوە.
یا پێت دەگەم،
یا وەک مۆمێک
دەسووتێم و دەتوێمەوە.

* * *

دەرگەکەتم لێ بکەوە!
هەر دڵدارەکەی جارانم،
هەر کێڵگەکەی بەردەرگەتم،
هەر تینووەکەی بەر کڕێوە و با و بارانم.

* * *

دەرگەکەتم لێ بکەوە!
من ئەو کەسەم،
تا دوێنێ بوو،
لەناو گەرووی ڕووناکیدا دەتشاردمەوە.
لەناو جامی مەترسیدا دەتخواردمەوە.

* * *

کات ـ لەژێر باڵی ئاسماندا
خەریکە باوێشک دەدات.
شوێن ـ قولەڕەشێکی کپە.
دەرگەکەتم لێ بکەوە،
شتێک نییە شیرینتر بێ
لە خشپەی پێ و چرپەی چپە.

* * *

دەرگەکەتم لێ بکەوە،
کفت و ماندووی ڕێگەی دوورم:
وەکوو جاران،
کەمێک لە لات دەمێنمەوە و ڕادەبوورم.

* * *

شەو ڕاشکا،

ئەژنۆم شل بوو،

مانگ بە تاقی ئاسمانەوە هەڵپڕووکا:

دەرگەکەتم لێ بکەوە،

دار و بەردی بەردەرگەتان هاتنە تکا!

١٩٦٩ ـ هەولێر

(١)

## کەژاوەی گریان #

برام، شێرکۆ!
کەژاوەکەی گریانی تۆ،
وەک ئادەمزادی ڕاپەڕیو
گیانی گەرمی لەبەردا بوو،
خەنجەرێکی جەوهەرداری
کۆرپاشای لە کەمەردا بوو.

لە پێشەنگی کەژاوەتا،

ئاڵای خوێنینی مەهاباد هەڵکرابوو.

لە تەک ئەودا،

سێدارەکەی چوارچرا بوو.

کە هاتە لام،

پەیامێکی وای بۆ هێنام،

وشەکانی

وەک پریشکی ئاگر وا بوون،

هی ڕۆژانی ئاڤێستا بوون...

خوێندمەوە و گەلێک گریام.

گریام بۆ خۆم،

گریام بۆ تۆ،

بۆ هەزاران

زیندووی نێژراوی ناو گڵکۆ.

* * *

برام، شێرکۆ!
ڕاست دەکەی تۆ:
دوو هەزار و پێنجسەد ساڵە
دەنووین... دەخۆین... لەسەر درۆ!
ڕاست دەکەی تۆ:
دوو هەزار و پێنجسەد ساڵە
گوێمان کەڕە،
زمانمان گیرۆدە و لاڵە.
بەڵام، هەیهۆ!
کەی لای ئێمە
پەسند بووە پیاوی ڕاستگۆ؟!

* * *

برام، شێرکۆ!
بەم چاوە دیم
زەردەخەنەی لە دواوە بوو
کەژاوەکەی گریانی تۆ.

له تنۆكی فرمێسكتدا
دەماری بازووی كاوەم دی،
لاشەی كەوتووی زوحاكم دی،
ئالآی بەرزی شەكاوەم دی،
ئاسۆیەكی ڕووناكم دی.

* * *

له تنۆكی فرمێسكتدا
زەردەشتم دی،
باوەشی خۆی دەگرتەوە
بۆ هەژار و چەوساوەكان.
بەهەشتم دی،
ڕاست دەبۆوە
لەسەر لاشەی چوار دیوارە ڕماوەكان!

١٩٦٩/٨/١٥ ـ كوردستان

( ٢ )

## هەگبەی دەنگوباس #

هاوڕێم! هاتی و بە هاتنت
تۆ بارانی گۆیژەت هێنا
بۆ هەڵگەڕانی بەرەو خۆر پەیژەت هێنا
مژدەنامەی زستانی زگپڕت هێنا
دەنگی مەزدە و یاخیبوون و گڕت هێنا

* * *

هاوڕێم!
ناوی خانزادت بردبوو #
باپێت بڵێم:
برچی خانزاد خۆڵەمێشە،
چاوی ڕەشی پڵیشاوەی ژێر پۆستاڵە،
چەپکەنێرگزی سەر گۆڕی -
سپیلکەی چاوی منالە!

* * *

هاوڕێم!
کە چوویتەوە سلێمانی #
لە ڕێگاتا لە بیر نەکەی:
لە قەلات و منارەوە،
لە موغەکانی شارەوە،
چەپکەهەواڵێک بەرەوە
بۆ خوا، بۆ بیرەکانی نەوت،

بۆ مەزاری بابەگوڕگوڕ،
بۆ ئەو شارەی
دانیشتوانی
لەناو گڕدا دەگرین بۆ گڕ.

لە بیر نەکەی:
دەنگوباسی شارەکەی من:
شاری مزگەوت و دەرۆزە،
شاری تینوو
بۆ ماچی جەژنەپیرۆزە.
لە بیر نەکەی:
دەنگوباسی ئەو منالەی... بۆ لەتێک نان،
تا ئێوارە...
بەر دەبێتە گیانی مردووی شەقامەکان.
لە بیر نەکەی:
دەنگوباسی
حەمە، چورچە، جومعە، کسۆ #

یەک بە یەک شێتەکانی شار...

دەنگوباسی مەیدانی کار،

چایخانەی پڕ،

هەمووی بەرە

بۆ خوا، بۆ بیرەکانی نەوت،

بۆ مەزاری بابەگوڕگوڕ!

١٩٧١/٣/١٥ ـ کوردستان

---

# **کەژاوەی گریان**: دیوانێکی شێرکۆ بێکەسە

# **هەگبەی دەنگوباس**: وەڵامی هۆنراوەی «دیدەنی»ی ش. بێکەسە، کە لە گۆڤاری هەولێر(شوباتی١٩٧١)پێشکەشی شاعیری کردبوو.

# **خانزاد**: مەبەست خانزادی سۆرانە،

# لەو سەردەمەدا هاتوچۆی نێوان هەولێر و سلێمانی بە شاری کەرکووکدا بوو.

# **حەمە، چورچە، جومعە، کسۆ**: چوار شێتی هەولێر بوون

# سێ نامەی کورت

## (١)

خۆشەویستم!

نامەکانم بسووتێنە.

ئەو هۆنراوەی بۆت نووسیوم

سێدارەی بۆ دامەزرێنە.

دڵگیر مەبە...

لە لای ئێمە، نەک تۆ، پیاویش

لەسەر وشەیەکی باڵدار

قۆڵبەست دەکرێ، دەدرێ لە دار.

دوور مەبینە،
گەر تۆی ئافرەت
بۆ چریکە دەنگ هەڵبڕیت،
شێتەکانی سەر کورسیی شار
گەرووی سەوزت بقڵیشێنن،
چاوی گەشت پڕ چقڵ کەن،
پرچی ڕەشت بسووتێنن.

( ٢ )

خۆشەویستم!

لە پیاوێکی گەڕۆکم بیست،

لە لای ئەوان کچانی کۆک،

لەباتی گوڵ،

هۆنراوە دەدەن لە بەرۆک.

گەورەکانیان

بۆ پەیکەری هونەرمەندێک دێنە سەر چۆک.

کەچی لە گشت کوردستانا،

لە مەڵبەندی

بێکەس و حاجی و گۆرانا،

گەر بگەڕێی سەر تا خواری وەک غەریبێ،

بەدی ناکەی تاپۆی پەیکەری ئەدیبێ!

( ٣ )

خۆشەویستم!

خاوەن وشە لەم وڵاتە

هەمیشە هاتی نەهاتە!

دەیانەوێ

خاوەن وشە وەک هەنگ وابێ -

هەرکە بە ڕووی کاغەز وەدات،

بمرێ وەکات!

دەیانەوێ،

وشەکانمان

کۆت و زنجیر بۆ پێیان بێ،

سایەی سێدارە جێیان بێ!

دەیانەوێ،
وشەکانمان
بێدەنگ بکەون بە ڕوودا،
وەک حەزرەتی سمایل کەوت
لە ژێر ڕەحمەتی چەقوودا!

دەیانەوێ،
بنووین، بخۆین... وەکوو ئەوان.
بنووسین، بڕێسین، بڕۆین... وەکوو ئەوان.

دەیانەوێ
کتومت «ئێمە» «ئەوان» بین...
وەک مەلێکی مۆمیاکراو،
بێ ئارەزوو، بێ ڕەوان بین!

١٩٦٩/٩/١٣ ـ کوردستان

## نیازێك هەڵوەری

نیازم وابوو
بتکەم بە چەپکەنێرگزێک
بۆ سەر مێزم.
لە سەرمای شەوی زستانا
گەرمت کاتەوە ئامێزم.

* * *

نیازم وابوو
ئەو سنگەی سەرینی نازە،
شەو لەسەری بهۆنمەوە
کەزیی زەردی شیعری تازە.

* * *

نیازم وابوو
پرچت بکەم بە هێلانە،
تا ڕووم ئاشنای سرەوتن کا.
گەردنت بکەم بە مۆمێک،
لە شەوانی هۆنراوەدا
قوژبنێکم بۆ ڕۆشن کا.

* * *

نیازم وابوو
تا ئەو ڕۆژەی لە یەکترمان دەکا مردن،
شادی بکەم بە گەردانە،
بیئاڵێنمە شووشەی گەردن.

* * *

نیازم وابوو
بۆت دەسگیر کەم
ئەستێرەی ئاسمانی زەبەند.
پەلکەزێڕینەت بۆ بگرم،
بۆتی بکەم بە کەمەربەند.

نیازم وابوو
گەر بەهاری ئەمجارە بێت،
پەساپۆرتی دەربازبوونی بسووتێنم،
نەهێڵم دەرچێ لەژێر پێت!

* * *

نیازم وابوو
ببمە گەرداو،
ببمە لافاو،
گەڵای زەردی
ساڵانی پڕ بەسەرهاتت ڕابماڵم.
بتکەم بەو دایکە بەسۆزەی
گۆی مەمکت بمژێ مناڵم.

* * *

هەرچی جوانە، هەمووم دەویست،
تەنیا بۆ تۆ، تۆی خۆشەویست.
وام دەزانی ژەنگ ناتگرێ.
وشەم لە فەرهەنگی دڵتا قەت نامرێ.

ڕۆژێک نەهات بە خەیاڵما
کە حەزت بڵقی سەر ئاو بێ،
هەر بۆ ناو بێ...
بەڵام، ئەمڕۆ
ڕاستی شەقی دا لە درۆ.
زانیم کەوا
چاوی برسی، لەشی برسی...
ویستی دنیای جوانپەرستیم
ببات بەرەو سەد مەترسی.

* * *

من دەربەست نیم!
ڕێگات چۆڵە بۆ باوەشی گەرمی لاوان.
فەرموو، بڕۆ، ئاگر بەردە لە هەناوان...
کێ خوێنگەرمە، هەرزەکارە،
بیخەرە زەڵکاوی تاوان.

تۆ دەربەستی،
من دەربەست نیم!
شیعر، ئاسمان، ئەستێرە، مانگ...
هەموو جوانن، بۆیان دەژیم.

من دەربەست نیم!
ئەمڕۆ، سبەی،
لە شیعرێکی خەمڕەوێنا،
لە دەفتەری بچکۆلەی بیرەوەریما،
لە هەزاران شادەمار و مێشک و خوێنا
تۆمار دەکەم
سەرگوزەشتەی ئەو مێخەکەی
چەنەم شل بوو
ئەوەندەی شیعری بۆ بڵێم،
لە دواییشدا، کە بایی بوو،
هەڵموەراند، نامە ژێر پێم!

١٣/١٠/١٩٦٩ ـ کوردستان

# دەنگێک لە کوردستانەوە

چەند حەز دەکەم
منی کوردیش
ئادەمزادێکی سەربەست بم.
بە چەلین و کەوشی کوردی
لە چیاکانی فەلەستیندا چەکبەدەست بم،
هێرش بەرم
بۆ سەر ئەو بووکەشووشانەی،

بۆ سەر ئەو داڵە تووشانەی
گۆشتی کۆرپەی ساوا دەخۆن،
مزگەوتەکان،
کڵێسەکان
بە خوێن دەشۆن.

* * *

چەند حەز دەکەم
بژیێنمەوە
داستانەکەی سەلاحەددین -
دیسان وەکوو بوومەلەرزە
ڕاچڵەکێنم دڵی زەمین.
تاو بسێنم وەک فەرتەنە،
لەسەر لێوی خاچپەرستان
ڕیشەکێش کەم زەردەخەنە.
بەڵام، چبکەم!

خۆشم ئەمڕۆ وا دەستبەستەم.
داگیرکەران لە چوارلاوە
ناهێڵن بجووڵێ جەستەم.

من کوردێکم...
هەرچەند ئەمڕۆ دەنگ هەڵبڕم،
دەنگم نییە.
من کوردێکم...
هەرچەند ئەمڕۆ خۆم نیشان دەم،
ڕەنگم نییە.
کوردستانی گەورە و مەزن،
وەک خەرمانی جوتیاری کورد، بەش کراوە...
باستیلێکە،
توند کوردی تێ ئاخنراوە.
بەڵام پەیمان...
هەزار پەیمان...

له دوارۆژا،
که خۆم بینی کەسێکم نایێ بە گژا،
که خۆم بینی،
له سێبەری کوردستانی ڕزگاربووما،
لەکەی دیلی سڕاوەتەوە لە ڕووما -
ئەوسا منیش،
وەک کوردێکی خاوەن کیان،
چەک هەڵگرم
بۆ هەر کەسێک بڵێ: ژیان!

پەیمان...
پەیمان...
هەزار پەیمان.
که ڕزگار بووم
لەو گەردەلوولەی تێی کەوتووم،
ئەوسا بڕۆم،
تا له خاکی فەلەستینی ئاسمان گەشا،

نەک هەر لەوێ،
لە جەنگەڵە چڕەکانی ناو ڤێتناما،
لە ئەفریقای قولەڕەشا،
لەئێرتیریای بێ بەهارا،
لە هەر خاکێک دۆلار بژی،
بژیێنمەوە سەد گیڤارا!

١٩٦٩/١٢/٥ ـ کوردستان

## له دەستم دێ

( له ساتێکدا که مرۆڤ دەبێته چەپکێک دەماری تووڕە،
هۆنراوەیەکی وا له دایک دەبێ )

له دەستم دێ
کاتژمێری کامەرانیت بوەستێنم.
له دەستم دێ
ئەڵقەی پەنجەت پێ فڕێ دەم،
نامەی بەختت بسووتێنم.

له دەستم دێ
هەموو شتێک ئاشکرا کەم.
کام شەوت گەش و ڕووناکە،
ئەو شەوی پف لە چرا کەم.

لە دەستم دێ، بە دوو وشە،
دڵی زاوای نووستووت ڕەش کەم،
لە خۆشاوی شەوی پەردەتان بێبەش کەم.

نامەکانت یەک یەک ماون.
دیارییە سادەکانت یەک یەک ماون.
چاویان شۆڕە،
دەست لەسەرسنگ بۆم وەستاون.
لەتاوی ئەو کارەساتەم
ئارەقەی شەرم دەتکێنن.
مۆری حەزێکی ئاگرین
بە ناو چاوتەوە دەلکێنن.

* * *

تاڵێکی پرچت نەماوە

تێرتێر بۆنم نەکردبێ.

جێی دەرزییەک

لە سنگی برسیت نەماوە

پەنجەم پەی پێ نەبردبێ.

گەواهی دەدەن لەسەرت

دارتێلەکانی سەر شەقام.

گەواهی دەدەن ئەوانەی

نامەی تۆیان بۆ دەهێنام.

بەڵێ، گیانە!

گەر بمەوێ

کاتژمێری کامەرانیت بوەستێنم...

گەر بمەوێ

ئەڵقەی پەنجەت پێ فڕێ دەم،
نامەی بەختت بسووتێنم ـ
بەڵگەم پێیە،
هەزار بەڵگەی ئاشکرا و ڕوون.
بەڵگەی چوار ساڵ پێکەوەبوون.
بەڵام... چبکەم!
خۆشەویستیت ـ نەهەنگێکە،
خوێنی هەڵچووم دەخواتەوە...
خۆشەویستیت ـ ڕووبارێکە،
قینی ڕەشم دەشواتەوە!

١٩٧٠/١/٢١ ـ کوردستان

# هۆنراوەیەکی ساکار

خۆشەویستم!

ڕۆژێ دادێ،

گڕ بەربێتە شار و لادێ.

ڕۆژێ دادێ، کورد بپرسێ:

کەی ڕەوایە لێک بپچڕێ

گەردانەکەی کەژ و کێوم،

بە پێدزە لەمیانەوە

بۆ ئەوی تر پێ ببزێوم؟

ڕۆژێ دادێ، کورد بپرسێ:
کەی ڕەوایە، خۆم برسی بم، کەچی لەولاش
بێگانەیەک گەنمم بکاتە قورگی ئاش؟
کەی ڕەوایە،
منالّی من سەرما پەنجەی بتەزێنێ،
دزی ڕۆژیش زێڕی ڕەشی بسووتێنێ؟

* * *

خۆشەویستم!
کە ڕۆژێ هات
وەلاّمی خۆمان دایەوە،
خوێنی تووڕەی ئاگرینمان
لە دەمارا جوولاّیەوە ـ
ئەو ڕۆژی خۆت مەشارەوە
تاکو پێکرا،
یەک دەنگ، یەک ڕا،

لەناو شریخەی تفەنگا،

لەژێر چەتری شەوەزەنگا،

کوردستانی ملیۆنەها لە ناحەزان

بکەین بە کێڵگەی کارەبا،

بە گۆڕستانێکی هەرزان.

لەپاڵ تاوێرە بەردێکا سەنگەر بگرین،

یا دێینەوە دەست لە گەردن

یا دەست لەسەر تفەنگ دەمرین.

٢٢/١/١٩٧٠ ـ کوردستان

# شەونامەی شاعیرێکی تینوو

## (١)

خۆشەویستم!

کە شەو دادێ، شەوی پایز،

کاتێ خشپەی گەڵای وەریو

پەلی هەستم دەگرێ و دەیبا

بۆ کۆتایی و دنیای ئەودیو -

من بەخیلی بە کۆتاییی گەڵا دەبەم،

چونکە، کە مرد،

داوڕێی هەیە دەمی زەردی بنێتە دەم!

( ٢ )

خۆشەویستم!

کە شەو دادێ، شەوی زستان،

کاتێ دەنووک لە گوێم دەدا تریەی باران،

کە خۆڵەمێش دادەپۆشێ

پۆلووەکانی ناو ئاگردان ـ

لەسەر دیواری بەردەمم

سیمای تەڵخی دڵدارەکانم ڕیز دەکەم،

چییان لێ هات؟

بۆ ڕۆیشتن؟

دەربەستی هیچیان نیم... بەڵام،

بەڵام... ئاخ... بۆ ئەوەی یەکەم،

کە ناتوانم لە بیری کەم!

( ٣ )

خۆشەویستم!

کە شەو دادێ، شەوی بەهار،

کە تاریکی وەک تاڤگەی کل

دەڕژێتە ناو گلێنەی شار،

کە ئەستێرە گەڕانەوە

لە ناشتنی تەرمی ماتی زێڕکفتی خۆر،

کە پەنجەیەک... هات... بزواندی

تەلی گیانی پڕ لە ناسۆر -

بڕوا بکە، خۆشەویستم!

لەو کاتەدا...

بۆ خەوێکی سەر مەچەکت دەگریم...دەگریم...

بە گیان، بە لەش، بە چاو، بە گوێ،

هاوار دەکەم: برسیم... برسیم!

( ٤ )

خۆشەویستم!

کە شەو دادێ، شەوی هاوین،

کاتێ ئاسمان

پەپوولەی خەو دەبارێنێ، خەوی شیرین.

کە سروەیەک دێ و بە کپی

بە گوێی ناخما دەچرپێنێ

ڕازی شەو و چواردەورەم و کوللەی سپی،

بڕوا بکە، خۆشەویستم،

لێرەدا... دڵی هەتیوم،

دڵی شەوی گەش نەدیوم،

وەکوو مانگی تەنیای ئاسمان

تێر دەداتە پڕمەی گریان.

گریان... بۆ چەرپای دووکەسی،
بۆ سەرینێکی دووکەسی.
گریان...
گریان...
بۆ چەناگە و بەرگەردنێ،
بۆ ئافرەتێک، تا بەیانی،
سەر بەسەر سنگمەوە بنێ.
گریان... بۆ یەک چرپەی شیرین.
گریان... بۆ یەک خورپەی شیرین!

١٩/٧/١٩٧٠ ـ کوردستان

# پرسیارێك

له یادمه،

ساڵ: کۆتاییی شه‌ستوشه‌ش بوو،

شار: مه‌چه‌ک بوو،

زستان: بازنێکی ڕه‌ش بوو.

ئێواره بوو...

بۆ یه‌که‌م جار

من هه‌ستم کرد به ته‌نگیی شار...

تۆش هەستت کرد بە تەنگیی شار.
دوور ڕۆیشتین...
لە سووچێکا پێک گەیشتین،
ڕەنگ بزرکاو، هەناسەسوار.
لە سێبەری خۆمان ترساین،
چاویان هەبوو دار و دیوار،
دەمیان هەبوو دار و دیوار!
بەڵام ئێمە یاخی بووین و
نەفرەتمان کرد لە خەڵکی شار
نەفرەتمان کرد لە چاوی شار...

* * *

لە یادمە،
هێشتا لێوم وەک بەفر بوو، چی نەدیبوو؛
هێشتا پەنجەم
یەکەم تەزووی گۆپکەی مەمکی نەچنیبوو؛

لە یادمە،

شارەکەمان هێشتا وەکوو کڵێسە بوو،

کە پێم گوتی:

« دڵدارێکم

پاک... وەک نیگات،

ڕووت... وەک نیگات.

دڵدارێکم

نیمە جوانتر

لە پەیکەری کۆکی بالآت.

نیمە جوانتر لە هۆنراوەم،

لە ژووری مۆم تیا کوژاوەم.»

توخواکەی... تۆش

کە دەتزانی باوکت، برات

دەترسکێنن بۆ ساڵێکی تووش و نەهات،

بۆچی چوار ساڵ دوو باڵی خۆت

بۆ گەردنی من کرد بە کۆت؟!

٦/١١/١٩٧٠ ـ کوردستان

## بۆ پارچەکەی ترم

خۆشەویستم!
بوو بە ساڵێ
چاوت دەستی چاوەکانی نەگوشیوم.
بوو بە ساڵێ
ئاوریشمی قژ
شان و ملی نەپۆشیوم.

بوو بە ساڵێ

گوێم تامەزرۆی ڕۆژباشێکە،

گوێم تامەزرۆی گیان باشێکە.

بوو بە ساڵێ

تینووترم

لە گەڵای زەردی هەڵوەریو.

تینووترم لە بیابانی

هەزاران ساڵ باران نەدیو!

* * *

کتێبەکان

گەرمایی تۆم پێ نابەخشن.

باڵندەکان

چریکەیان تامێ چپەی شیرین نادا.

ئەو بتانەی

لە دوای تۆ هاتنە پەرستگەم

بە یەک سرووەی بیرەوەریت دێن بە لادا.

* * *

وەرە، گیانە!

لە تۆڵەی خۆم،

لە تۆڵەی تۆ،

لە تۆڵەی ئێسکی ناو گڵکۆ،

لە تۆڵەی مەم،

لە تۆڵەی زین،

هەزاران مەم...

هەزاران زین...

کارتۆنەکان بسووتێنین،

دیوارەکان بڕووخێنین.

جامبازەکان

ئەوانەی وەک پارچەیێ گۆشت،

تۆیان برد بۆ هەڕاجخانە،

تۆیان فرۆشت،

وەرە، گیانە،
برۆ و سەریان با بتاشین، هەشی پیا کەین.
گەر مەم و زین وایان نەکرد،
ئەدی ئێمە بۆ وا ناکەین؟
دە پێم بڵێ، بۆ وا ناکەین؟!

١٩٧٠/١٢/٢٧ ـ کوردستان

## خۆشم دەوێی #

خاتوونەکەم!
بیستووتە ئاسمان چەند دوورە؟
من بارتەقای دووریی ئاسمان
خۆشم دەوێی!
بیستووتە دەریا چەند قووڵە؟
بەقەد قووڵیی گشت دەریاکان
خۆشم دەوێی!

* * *

گیانەکەم، تۆ نووسراوێکی
دێڕت بەقەد تاڵی پەرچەم.
من چوار ساڵە دەتخوێنمەوە،
چەند باڵی بیرم لێک دەدەم،
نە تێر دەبم، نە تێت دەگەم.

* * *

زۆر دەترسم،
لەناو دێڕی شیعرەکانما شار بتناسێ،
کامیرەی چاوی مەرگەوەڕ
وێنەت بگرێ و هەڵیواسێ.
زۆر دەترسم،
گەر بتناسن، پەنجەکانم هەڵوەرێنن،
شابسکی تۆش بسووتێنن.

بەڵام هێشتا من دەربەست نیم،
هەرچیم دیوە،
هەرچیم بۆ چاوت نووسیوە،
نایشارمەوە!
تا چۆک بدا لە دەروونتا دێوی گومان.
تا گەورە و بچووک بزانن
خۆشم دەوێی...
خۆشم دەوێی سەد بارتەقای دووریی ئاسمان.

١٩٧١/١/٧ ـ کوردستان

---

# ئیلهامی کۆپلەی یەکەمی ئەم هۆنراوەیە لە گۆرانییەکی فەیرووز وەرگیراوە

# درەنگ نییە

( ١ )

خۆشەویستم!
کە ژوورەکەم جێدەهێڵیت
تیشکی خۆر لە ژوورەکەما
بوخچەی خۆی دەپێچێتەوە،
میلی سەعات
خولی لە یاد دەچێتەوە.

که ژوورەکەم جێدەهێڵی و لەلام دەڕۆی،
هەر چواردەورم، وەک دارەمەیت،
دەستی سرِم دەگرێتە خۆی.
لە پەنجەرە و دەرگاکەوە
بۆ قوڕگم دێ دەستی زریان.
کتێبخانەی بچکۆلانەم،
دیوارەکان،
هەموو یەک یەک دێنە گریان،
لەگەڵ مندا دێنە گریان.

( ٢ )

خۆشەویستم!

دنیا ساردە... ئاو شەختەیە...

دڵی تەنیام هەڵپەیەتی

بۆ لێوێکی گەرم، گەرم،

گەرم وەکوو پشکۆی پەتی.

( ٣ )

چ ڕوو دەدا با ڕوو بدا!
دڵنیا بە، جێم مەهێڵە.
باوەشی من - بەهەشتێکە،
دەتپارێزێ لە ڕەهێڵە.

جێم مەهێڵە...
درەنگ نییە...
با نیگای چاو دڵنیابێ،
ئێستا... خۆرت بۆ ڕادەگرم،
ناهێڵم وا زوو ئاوابێ!

١٩٧١/٤/١١ - کوردستان

## زامی زیندووی شێللی #

دەشێ تاریکی و تیشکی خۆر بەیەک بگەن.
دەشێ زەوی و میچی ئاسمان بەیەک بگەن.
دەشێ قوتبی سەروو و خوارووش
بەیەک بگەن.
بەڵام هەرگیز
ناشێ من و خۆشەویستم بەیەک بگەین.

* * *

دەشێ ئەهریمەن بەهەشتی خوای بەرکەوێ.
دەشێ ڕووبار
ڕوو لە هەوراز بێ و سەرکەوێ.
دەشێ مەم زیندوو بێتەوە،
لەسەر سنگی زین بسرەوێ.
بەڵام ناشێ، جارێکی تر،
منی دڵدار بگەم بەوەی خۆشم دەوێ.

* * *

ڕەنگە کچە دراوسێکەم،
یا ئەو کچەی
ئەمڕۆ، سبەی،
ئەڵقەی من دەکاتە پەنجەی
وا تێ بگا
پەلکەزێڕینەی هۆنراوە
بۆ کەمەری ئەو ڕێک دەخەم.

بۆ ئەو تۆقەی زێڕینی خۆر

لە پرچی ڕەشی شەو دەدەم.

نەیزانیوە

هۆنراوەی من بۆ کەسێکە،

کاسە خۆشاوێک بوو... ڕژا.

چەپکێک بۆن بوو

بە نوێنی... کەسێکی تردا هەڵپژا.

۱۹۷۱/٥/۱۷ ـ کوردستان

---

# شێللی: پێرسی شێللی ( ۱۸۲۲ - ۱۷۹۲ ) شاعیری ڕۆمانتیکی ئینگلیز.

## ژانی شەوانی کەنداڵ#

وشەکانی شیعری ئەمشەو

ڕەوە کۆترێکی سپین.

لە بەندیخانەی سنگمدا

سەرسام دەژین.

دەنووک لە زامم وەردەدەن.

ئاگر لە هەستم بەردەدەن.

دەیانەوێ
دەروازەکەی سنگم لەق کەن،
لە دەلاقەی زامێکەوە ڕزگار بن و
تارای شینی ئاسمان شەق کەن.
بەڵام دوودڵم، نازانم،
لەبەر پەنجەرەی کام کچا
بەرەڵڵاکەم کۆترەکانم؟
لەدوای ئەوەی خۆشەویستم
پەنجەرەی خۆی لێ داخستم.

* * *

دەزانم... ئەمشەو... ژانەکەم
هەورێکە، بارانی پێیە.
هەر دڵۆپێک لەو بارانەش
هەگبەیەکی پڕ ئاوازی بێ گرێیە!
بەڵام دوودڵم، نازانم،

بەسەر کام کێڵگەی تینوودا... تێر ببارم؟
بۆ شەوی تاریکی کام قژ... چرای هەستم
بسووتێنم و
چەپکێک ڕووناکی ببەستم؟
لەدوای ئەوەی
خەرمانی خەونی منالّی
گەردەلوولی شین ڕایماڵی.

* * *

دەتوانم... ئەمشەو... ژانەکەم
بکەم بە ڕستەبازنێک
بازنی وا
خەونی زەندی خانزاد بووبێ،
شاعیرێک داینەڕشتبێ... بۆ شاژنێک.
بەڵام دوودڵم، نازانم،
بۆ کام مەچەک لە دایک بن بازنەکانم؟

لەدوای ئەوەی
کۆتری مەچەکی سپیی خۆشەویستم،
بێ ماڵئاوایی، بە کڕی،
لە شەقەی باڵی دا، فڕی!

١٢/١٠/١٩٧١ ـ کەنداڵ

# کەنداڵ – گوندێکی نزیک مەخموورە، لە ساڵانی (١٩٧٠–١٩٧١) تێیدا مامۆستا بووم.

## ئەوپەڕی تاسە

چۆن دڵت هات
لەگەڵ سەرینی تەنیاییی دەرزی چنا
جێم بهێڵیت؟
چۆن دڵت هات،
لەگەڵ شەوی ساردوسڕی بێ نووستنا
جێم بهێڵیت؟

بگەڕێوە!

ژووری تەنیام چاوەڕێتە.

بگەڕێوە!

عومری زاوام

شەیدای بووکی ترپەی پێتە.

٢٢/١٠/١٩٧١ ـ کوردستان

# دوا لاپەڕەی یاداشتی دڵدارێك

بەڵێن بدە:

کە تاریکیم بۆ ڕاناخەی،

بەڵێن بدە:

کە شەختەبەند ناکەی بەرپێم.

منیش بەڵێنت پێ دەدەم،
دان بە ڕابردووما بنێم:
پێش چاوی تۆ
لە پەرداخی وەنەوشەییی
چاوی ترم پێک هەڵداوە.
پێش نامەی تۆ
قژی گەلێک نامەی ترم داهێناوە.
پێش سنگی تۆ
زۆر سنگی تر
چەپکەگوڵی تەزووی سووریان بۆ چنیوم.
پێش ژوانی تۆ،
زۆر ژوانی تر
ڕێگەی دووریان پێ بڕیوم.

* * *

شاعیرێک بووم...
گەرووی وشکم
بە دوای قومێک ئاودا وێڵ بوو،
بۆ بارانی هەر ئاسمانێک نووشتامەوە
ئاوی لێڵ بوو.

* * *

گەر دەتەوێ
خوێنی دەماری شیعرم بیت،
داستانێک بیت بێ کۆتایی،
گەر دەتەوێ
خۆشەویستیت بەدوایدا نێت
ماچی ساردی ماڵئاوایی:
بەڵێن بدە ئاسمانم بیت.
بەڵێن بدە،
هەناسەم بیت، سێبەرم بیت، بارانم بیت.

تاکوو منیش
شانۆی کۆنم جێ بهێڵم،
دەمامکی ڕووم فڕێ بدەم،
دوو باڵی پڕ خۆشەویستیم
لە گەردنت گرێ بدەم.

١٩٧١/١١/١٠ ـ کوردستان

# دڵنیام کە

گەر دەزانیت

تۆش، خۆری ئێوارەئاسا،

ئاوا دەبیت،

گەر دەزانیت

باڵدارێکی بێ لانەیە

خۆشەویستیت:

لە ئێستاوە

باڵی پەپوولەی نەوحەزم

ببەستەوە بە تاڵەموویەکی کەزیت،

بیدە بەدەم لافاوەوە تاکوو زووە.

من بێپەروام!

زۆر حەزی وام

بەم دەستانەی خۆم ناشتووە.

٢٨/١١/١٩٧١ ـ کوردستان

## بەفر و پشکۆ

بمزانیایە
جارێکی تر
سێبەرم سێبەرت شانە ناکاتەوە،
بمزانیایە
جارێکی تر
خەیامی دەروونی هەڵچووت
پێکی وشەی شیعرەکانم ناخواتەوە:

پشکۆی هەزار ئاگردانم

دەهێنایە سەر لێوی خۆم،

تا کتێبی ماچی دوایی بکەینەوە.

بەفری هەموو نسارانم

دەهێنایە سەر لێوی خۆم،

تا پێت بڵێم:

چیتر بەیەک ناگەینەوە!

١٩٧٢/١/١٩ ـ کوردستان

# هۆنراوەم ئاوزینگ دەدا

گەر حەز دەکەن
سەرینی منداڵەکانتان
گوڵمێخەکی لەسەر شین بێ،
دەوروپشتی بێشکەکانیان
پڕ لە خەونی بەفرڕەنگی ئارمووشین بێ،
دەسرازەیان -
پەلکەزێڕینەی ئاسمان بێ،

دڵی مەسیح -
بووکەشووشەی یارییان بێ؛

گەر حەز دەکەن
ڕەزەکانتان پڕ مێوە بن،
خۆر لە لافاوی خەندەتان بخواتەوە،
هەوری گران
نامە لە کێڵگەکانتان نەبڕێ و
پێڵووی خاوی کانییەکانتان هەڵداتەوە:
بەرەڵڵا کەن، بەرەڵڵا کەن
ئەو باڵندەیەی... هێلانەی
لەسەر زمانم کردووە.
بەرەڵڵای کەن!

١٩٧٢/٦/٤ ـ کوردستان

# دوازده وانه بۆ منداڵان

و

# چەند شیعرێکی قەدەغە

چاپی یەکەم ـ بەرلین ـ ١٩٩٧

# پێشەکی

(دوازدە وانە) لە نێوان ١٩٦٩ ـ ١٩٧١ دا، لە هەولێر و گوندی کەندالّ نووسراوە.
یەکەم جار، ڕۆژی ١٩٧٢/٣/٢٢، لە فێستیڤاڵی شیعری کوردی، لە شاری کەرکووک خوێنراوەتەوە.
چارەنووسم، چ وەک شاعیر چ وەک مرۆڤ، چ بەلای باشەدا، چ بەلای دەردوبەڵای دنیادا، تا ڕادەیەکی زۆر دەرەنجام و دارشتەی ئەم شیعرەیە. دەمەوێ بڵێم: ئەگەر ئەم شیعرەم نەنووسیبا، کە نووسیشم چارم نەدابا و ڕووبەڕووی سیستەمی بیرکردنەوەی ئەوان ڕۆژان نەبامایەوە چارەنووسێکی دیم دەبوو.

عەبدوڵڵا پەشێو

هێلسنکی ـ 2.10.2002

## وانەی یەکەم

منداڵەکان!

ئەی یاخییە ژیندتاڵەکان:

سبەی ئێوە کە گەورە بوون،

لە لاوکا،

لە حەیرانا،

لە مزگەوت و دیوەخانا،

لە چیرۆکا،

لە هۆنراوەی شاعیرێکی ترسنۆکا،

ڕەنگە زۆرتان بەرگوێ کەوێ

باسی ئێمە و ئازایەتی،

باسی ئێمە و کوردایەتی،

بەڵام نەکەن بڕوا بکەن،

هەمووی درۆن، درۆی پەتی!

## وانەی دووەم

منداڵەکان!

ئێمە تووشی سەد کوێرەڕێین...

چرای بیرمان گەلێک کزە،

هەنگاوی کوێرانە دەنێین!

* * *

منداڵەکان!#

ئەفسانەکان دەگێڕنەوە:

هەبوو... نەبوو...

هۆزێک هەبوو لە خاکێکا.

پاڵەوانیان -

چاوی کوێر بوو،

هەوای دەورەی خۆی دەپێکا.

فەیلەسووفیان -

فاڵچییەک بوو،

شەوان فاڵی دەگرتەوە،

تا بزانێ کەی دوژمن بۆی

پەت دەخاتە گەردنی خۆی.

پیاوماقوولیان -

کەڕ و لاڵ بوو،

ماوەی کورتی ئارامیشی هەزار ساڵ بوو!

هۆزی نەگبەت

شەوی دەژمارد،

ڕۆژی دەژمارد،

سێ ژەم نان و چەپڵەی دەخوارد،

چاوەڕێ بوو کە دوژمن بۆی

پەت بخاتە گەردنی خۆی!

# یەکەم جارە چاپ دەکرێ. پایزی ۱۹۸۰، لە ڤیەننا، هاوڕێم د. کوردۆ عەلی وەبیری هێنامەوە.

## وانەی سێیەم

منداڵەکان!

ئێوەن زەلکاو دەشڵەقێنن،

ئێوەن ئەو بوومەلەرزانەی

سبەی کانی دەتەقێنن،

ئێوەن سبەی

سنووری دەستکرد دەشکێنن،

قەفی زنجیری لێکپچڕاو

بە یەکترەوە دەلکێنن.

ئێوەن سبەی

لە قامیشلی،

لە دیاربەکری شێخ سەعیدا،

لە سلێمانیی بریندارا،

لە مەهابادی ( قازی ) دا،

بە یەک فەلسەفە پێدەگەن،

گشت تێدەگەن:

ئەوەی کورد بێ، نەوەی نوێ بێ،

دەبێ تێشووی

ڕێی یەکیەتیی کوردی پێ بێ!

## وانەی چوارەم

منداڵەکان!

لە وانەکانی دوێنێمدا

گوتم ئێمە، لەوەتی هەین،

درۆ لەگەڵ خۆمان دەکەین،

لە ژیتمانا،

لە کردەوە و نووسینمانا بێ فەلسەفەین.

ئەمەم گوت و دنیا ڕما،
هەوری تانە
بەرەو ئاسۆی بیرم جما!

منداڵەکان!
توخواکەی بپرسن لێیان،
بپرسن لەوانەی چاویان
تینی ناگاتە بەر پێیان،
مەترسن، بپرسن، بڵێن:
لە سەفەری دوورگەی خوێنا
بۆ منداڵان چیتان هێنا؟
پێمان بڵێن، چیتان هێنا؟!

# وانەی پێنجەم

منداڵەکان!

ئەی بێلانە ژینتاڵەکان:

زۆر لەمێژە دایکەکانی ئەم وڵاتە

مەمکەکانیان

شیری سەربەستیی تیا قاتە.

زۆر لەمێژە کێوەکانی ئەم وڵاتە،

پێغەمبەرێکیان تیا قاتە!

منداڵەکان!

لە ئاگردانی چاوتاندا،

من چاوەڕێی زەردەشتێکم،

بێ، جێ بەو بتانە لەق کا.

من چاوەڕێی

چەخماخەی ئاڤێستایەکم،

بێ، جەرگی تاریکی شەق کا!

## وانەی شەشەم

منداڵەکان!

سەنگەر سەنگەر، چیاکان گەڕام،

گوێم لێ بوو، کۆمەڵێک قەوان #،

لە ناو سەنگەرێکی چۆڵدا،

لە پێشمەرگەی شەهید دەدوان!

---

قەوان: قاوغی فیشەک، قەپێلکی بەتاڵی گوللە

# وانەی حەوتەم

منداڵەکان!

دەسگیرانم کۆترێکی دیاربەکرە.

حەزی لە چیا و قاسپەی کەو و ڕەنگی بەفرە.

بۆ گواستنەوەی

زنجیرەی چیام قەف قەف بڕی.

ڕۆژ ژمێرم پەڕ پەڕ دڕی.

پەساپۆرتم؟
ئاوات و زەردەخەنە بوو،
کلدان و کیسێک خەنە بوو.
کە لە دەرگەی سنوورم دا،
لە باتی ماچ،
ماچی گەرمی دەسگیرانم،
تفی زەردی پۆسنالڕەشێک
هات... سواخی دا ناوچەوانم!

# وانەی هەشتەم

منداڵەکان!

ئەی برسییە ژینتاڵەکان،

لەسەر سنگە نەوتاوییەکەی بابەگوڕگوڕ،

نێزیک تاقگەی سەرەوژووری زێڕینی گڕ،

گڵکۆیەکی بچکۆلەم دی.

لێی نووسرابوو:

« ئا لێرەدامناڵێکی چاوگەشی کورد

لە برسان مرد! »

## وانەی نۆیەم

منداڵەکان!

ئەوەی دەنکەگەنمێکی چاند -

گوڵەگەنمی دروێنەکرد.

ئەوەی دڵۆپێک خوێنی چاند -

تابلۆیەکی بۆ خۆی نەخشاند.

ئەوەی تەنیا هاوارێکی لە دەم دەرچوو -

گوێی لە سەدای دەنگی خۆی بوو.

کەچی، ئێمە
کاسەسەر و چاو دەچێنین،
بارانی خوێن بەسەریانا دەبارێنین،
هێشتا وەرزی دروێنەشمان دیار نییە.
تا گوڵەگەنمێکی کێڵگەی
ئەو خوێنەشمان دیار نییە.

* * *

مناڵەکان!
با ئەو جۆگەیە بگۆڕین
کە خوێنمانی پێدا دەڕوات.
با ئەو زەمینەش بگۆڕین
کە چاو و کاسەسەر دەخوات.
ئەوجا کێڵگەی رووناکیتان نیشان دەدەم.
ئەوجا وەرزی دروێنەتان بۆ ڕست دەکەم.

## وانەی دەیەم

منداڵەکان!

لەسەر ناوچەوانی زەردی ڕۆژنامەکان،

لەسەر بۆرییە نەوتەکان،

لە دیواری ئاودەستخانەی مزگەوتەکان،

دە ملیۆن جار

نووسیمان: « بژی چەوساوە »

نووسیمان: « بژی کرێکار »

بەڵام هەموو نووسینەکان،
تەنیا جارێ،
نەیانتوانی ببنە پاروو،
تێر کەن زگی کرێکارێ!

## وانەی یازدەم

منالّەکان!

ئەی بێلانە ژینتالّەکان،

شەو لە خەوما ڕێبوارێک بووم.

بۆ بارەگای ( یوتان ) # دەچووم.

کە دەروازەکەی قووتی دام

ڕەشم بینی ـ ئالاّی هەبوو،

سپیم بینی ـ ئالاّی هەبوو،

هەرچیم بینی ـ ئالاّی هەبوو.

قیژاندییان:

« ئەی بێ وڵات، بۆ دەرەوە!

"ئەی بێ ئاڵا، بۆ دەرەوە! »

منیش گوتم:

" مەقیژێنن!

کە دەچمەوە،

ئەم چیرۆکە بۆ منداڵان دەگێڕمەوە! "

---

# یوتان ( ١٩٠٩-١٩٧٤ ) سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٩٦٢-١٩٧١ ز

# وانەی دوازدەم

منداڵەکان!

کە وانەکان دەخوێننەوە،

ئەگەر ڕۆژ بوو-

لە کونجێکا کپ هەڵتووتێن،

ئەگەر شەو بوو-

با چراکان کز بسووتێن.

چاک دەزانم،

گەورەکانتان بتانبینن،

داختان دەکەن،

وانەکانم دەسووتێنن،

دێن، دووبارە ،

جەستەی حەللاج دەدەنەوە لە سێدارە!

## نەورۆزی ١٩٦٩

پرسیم لە کاوەی باپیرم،
گوتم: بابە! وا دەست بەستەم،
دە پێم بڵێ، چۆن دەگەمە
نەورۆزەکەی سەدەی بیستەم؟

گوتی:ڕۆڵە! گەر کوردستان
بکەن بە پارچە ئاگرێ،
نەک زوحاکێک، هەزار زوحاک
مل کەچ دەکا و خۆی ناگرێ!

١٩٦٩ ـ کوردستان

---

یەکەمجار لە نەورۆزی ١٩٦٩ دا، لە مەخموور، خوێنراوەتەوە

## بۆ شۆڤێنیم؟

وا ڤێتنامی

بۆ ڤێتنامیان سەردادەنێن.

فەلەستینی دەمرن، دەژین،

بۆ هەر دڵۆپەئاوێکی،

بۆ هەر بەردێکی فەلەستین.

ئەگەر منیش داوا بکەم

سەربەست بژیم، وەکوو پیاو،

لە کوردستانێکی ئازاد،
نەک لەتلەت و پێشێل کراو،
بۆ شۆڤێنی و خۆپەرستم؟
دە پێم بڵێ، خۆشەویستم،
بۆ شۆڤێنی و خۆپەرستم؟

١٩٧٠ ـ کوردستان

# ئاڵا

دۆستەکانم! باش بزانن،

دوژمنانم! باش بزانن:

چەند باوەڕم بە زەردەشت و

بە ئاڤێستا و بە خوا هەیە،

هەزار هێندەش

باوەڕم بە هەڵکردنی ئاڵا هەیە!

١٩٧٠ ـ کوردستان

---

یەکەمجار ڕۆژی ٩٧١/٦/٢٤ لە شاری کۆیێ، لە میهرەجانی حاجی قادردا خوێنراوەتەوە

## ئەپۆڵڵۆ #

ئەی مانگ، گەڕیدەی بێ وڵات،
سووچی خۆت بوو ئەپۆڵڵۆ هات!

منی کوردیش، ڕۆژانی زووم،
وەک تۆ، لە پۆپەی بەرزی بووم

کەچی پاکی و ڕووناکیی خۆم
بوون بە مایەی نەگبەتی بۆم:

پارووم، نەوتم، دەشتم، گردم،
هەموویان لێ داگیر کردم!

١٩٧٠ ـ هەولێر

---

# کەشتیی ئەپۆللۆ یەکەم مرۆی لەسەر ڕووی مانگ دابەزاند. یەکەم جار ئێوارەی ڕۆژی ١٩٧١/٦/٢٤ لە شاری کۆیە، لە میهرەجانی حاجی قادری کۆییدا خوێنراوەتەوە. کاک فەخرەددین تاهیر کاسێتی مەهرەجانەکەی بۆ ناردم.

## سەرکەوتن

سەردەکەوین!
چونکە دوێنێ
تۆپە قوڕێکی دەستکردم
دایە دەست منداڵێکی کورد،
ئەو، لەباتی بووکەشووشە،
تفەنگێکی بچکۆلانەی لێ دروست کرد!

١٩٧١ ـ کوردستان

# ئاشتی

خوا دەزانێ

باڵای تفەنگم خۆش ناوێ!

بەڵام، ئاخ! کۆترەکەی ئاشتی

کرە وەکوو شێرەبەفرینەی بەیانی،

لەسەر لوولەی تۆپی ماتی وەستا ڕەجەب #

دەنووکی خۆی

خستۆتە ژێر باڵەکانی.

وەک بیستوومە،
ئەو کۆترە مانگرتووە،
لە ئاسمانی وڵاتێکی بێ ئاڵادا،
بە شریخەی تفەنگ نەبێ،
قەت لە شەقەی باڵی نادا!

٢٣/٥/١٩٧٣ - کوردستان

---

وەستا ڕەجەب: چەکسازێکی بەهرەداری کورد بوو، گەلێک تۆپی بۆ شۆرشی پاشای گەورەی ڕواندزی دروست کرد، تا ئێستاش هەندێکیان هەر ماون.

## تەعریب #

له ئاسمانەوه نەهاتووم،

من مێوان نیم.

من مێوانی سێبەرقورسی کوردستان نیم.

بەر له مێژوو

کانییەک بووم، لێره دەربووم.

بەر له مێژوو

ئاگرێک بووم، لێره هەڵبووم.

بار کەن، بڕۆن!
کانیاوەکان، جگە لە من،
کەسێکی تر تێرئاو ناکەن.
دار گوێزەکان، جگە لە من،
بۆ هیچ کەسێک
سێبەری خۆیان هەڵناخەن!.

بار کەن، بڕۆن!
زەویی ئێمە
دانی ئێوەی لێ شین نابێ.
مێرگەکانمان
لەژێر پێی گارانەکانتان وەک ئاگرن...
تا دارتووشمان یاخی دەبن،
جۆلانەیەک بۆ منداڵتان ڕاناگرن!
بار کەن، بڕۆن!
بار کەن، بڕۆن!

مێوەی درەختەکانمان کاڵە،
ئاومان سوێرە،
هەنگوینمان بە دەمتان تاڵە!
بار کەن، بڕۆن!
بار کەن، بڕۆن!

١٩٧٣ ـ کوردستان

---

# (تەعریب) یەکەم جار لە ١٩٧٣/٨/١٦دا، لە یانەی مامۆستایانی شاری کەرکووکدا، خوێندرایەوە. ڕووی ئەم شیعرە لەو عەرەبە بەعسییە داگیرکەرانەیە کە بۆ عەرەباندن ناردرابوونە کوردستان، نەک عەرەب بە گشتی کە دراوسێی لەمێژینەی گەلی کوردستانن..

لەو کاتەدا پۆستە گەیشت...
پۆستەی ڕەشی بەغدا گەیشت.
نامەی گڕ و ساچمەی هێنا
بۆ ئەو گوندەی خونچەکانی
هەڵنەسابوون لەناو نوێنا...
لەودیو هەوران
تۆزێک خڵتەی ویژدان ما بوو،
تا ئەوەشی لەبن پێ نا!

ئێستاش دەگێڕنەوە و دەڵێن :
بێشکەیەکی لاسووتاوی... تەنیا جێماو
بە کوڵ دایە پرمەی گریان
بۆ کانییەک گڕوگاڵی
تاهەتایێ خەفەکراو

ئێستاش دەگێڕنەوە و دەڵێن :
لەو کاتەدا

زەوی گریا،

ئاسمان گریا،

ئینجیل گریا،

قورئان گریا،

گریا... گریا...

هەموو شتێک، بێدەنگ گریا.

تەنیا لەناو مناڵدانی ئافرەتێکا

گیانێکی نوێ چاوی پشکووت،

نیگای گێڕا و لەپڕێکا

لەناو مشکیی دوای دۆزەخا

trووسکایی ڕابوونێکی تازەی پێکا.

١٩٧٢ ـ ١٩٧٣ کوردستان

# تابلۆیەکی زستانی

ئەمشەو دەستم
بۆ فەرهەنگی نیوەشەو برد.
وشەکانی مێروولە بوون،
لە بەردەمما ڕایان دەکرد.

* * *

ئەو مناڵەی ئێوارێ دیم

لە سێبەری مزگەوتێکا

برسێتیی لە خۆی لوول دابوو،

داوەڵی خوای خۆی دەپێکا ـ

ئەمشەو لای من میوانێکە،

لە بنمیچی ژوورەکەمدا ڕاکشاوە.

بە ئەنگوستە لاوازەکان

ئەستێرەکان دەسڕێتەوە،

بەری کڵاوڕۆژنەی گرتووم،

لێ ناگەڕێ

بۆ بسکۆڵەی کراوەی مانگ بکرێتەوە.

* * *

ئەی مێوانە بچکۆلەکەم!

بۆ مان دەگریت؟

چیت لێم دەوێ؟

وەرە خوارێ!
بەیانی زوو
کڵافەی ڕێ دەکەمەوە،
قاسەی ئاسۆت بۆ دەشکێنم،
کولێرەی زێڕ دەردەهێنم.

وەرە خوارێ!
سەری ئەستێرەکان مەبڕە.
بەری کڵاوڕۆژنە مەگرە.
لێفەی ئەیبووب بەخۆتدا دە،
تا درووشمی سەر تاقەکان دەسووتێنم؛
چیلکەی پەنجەی ترسنۆکی شاعیرەکان،
کورسی و مێزی
ژووری کۆشکە سامناکەکان دەسووتێنم.
بەیانیش زوو
لە بیر ناکەم،
کڵافەی ڕێ دەکەمەوە،

قاسەی ئاسۆت بۆ دەشکێنم،
کولێرەی زێڕ دەردەهێنم.
وەرە خوارێ!
سەری ئەستێرەکان مەبڕە،
بەری کڵاوڕۆژنە مەگرە،
ئەی مێوانە بچکۆلەکەم،
وەرە خوارێ!

١٩٧٢/١١/٩ ـ گوندی گەلیاوە

# نامەیەک بۆ دەرەوەی وڵات

سنوور دەنگم دەخواتەوە.
ڕێی چاپخانە
بە ژێر قەڵەمێکی سووردا تێدەپەڕێ.
جۆکەرەکان دەرگەکانیان داخستووە،
فەرشی سووریان
بۆ بێدەنگیم ڕاخستووە.

دوا هۆنراوەم،
لەوەتی لە دایک بووە،
وەک سمۆرە،
لەسەر چڵە درەختێکی
سەوزی زمانم نووستووە.

* * *

بۆم نووسیوی.
هەندێک شتی وردیلانەم بۆ نووسیوی...
هەندێک شیعری
وەک باڵداری بێهێلانەم بۆ نووسیوی...
بەڵام چبکەم!
پۆستەیەکی ئەم وڵاتە نادۆزمەوە،
نامەکانم بۆ تۆ بێنێ.
ڕۆژنامەیەک نادۆزمەوە،
لە پێخەفی دێرەکانیا
سبەینان ماچ چاو هەڵێنێ.

بانگتان دەکەم!
ئەوینداران، بانگتان دەکەم:
ئامادە بن!
با کۆنگرەی خۆمان ببەستین،
بڕیار بدەین
پۆستەخانەیەک دروست کەین،
نامەکانمان ببا و بێنێ.
چاپخانەیەک دامەزرێنین،
لە پێخەفی دێرەکانیا
سبەینان ماچ چاو هەڵێنێ!

هەولێر ـ ١٩٧٢/١٢/٣٠

## دوو پێشەکی

بۆ هۆنراوەیەک کە هێشتا نەمنووسیوە

(١)

تووڕە مەبن لە دووکەڵی وشەکانم.

دووکەڵی من:

پەڕەسێلکەیەکە ماندوو...

لە هێلانەی ئاگرەوە بۆ دوور دەفڕێ.

تووڕە مەبن لە گەرداوی وشەکانم.
گەرداوی من شوانکارەیە،
ڕانەهەورێکی مانگرتوو
بۆ قەدپاڵەکان لێ دەخوڕێ.

(٢)

- بووکیان دزی.
+ زوڕنامان خۆش.
- بووکیان کڕی.
+ دەهۆڵمان خۆش.
- بووک ئێوە خۆش.
+ هەڵپەڕکێی ناو سەهۆڵمان خۆش!

زاوا، هەڵسە،
هەڵسە، ڕابە!
زوڕناکانیان وردوخاش کە،
زەمانەکانیان لە ئاش کە.

٢٠/١/ ١٩٧٣ - هەولێر

## کۆسە

هاتن، هاتن، کۆسە هاتن.

هاتن، هاتن،

دەرگە داخەن، کۆسە هاتن:

«هەیاران و مەیاران

یا خوا داکاتە باران

بۆ فەقیر و هەژاران»

* * *

کەسێک دەرگە لە ڕووی کۆسە نەکاتەوە!
ساڵەهایە
تەونی درۆ هەڵدەبەستن
کۆسەکانی ئەم دنیایە.
ساڵەهایە
دەروازەی ئاسمان داخراوە،
چاومان وەک پوول
بە زەرفی ڕەشی ڕوخساری
کۆسەکانەوە نووساوە.

* * *

ساڵەهایە، ساڵەهایە،
بەقەد ئەسپێی نیفۆکانمان،
بەقەد ڕشکی تووکەسەرمان،
هەوری بەڵێن بەم خاکەدا تێدەپەڕێ و
دڵۆپە بارانێک نایە.

ساڵەهایە،

ساڵەهایە،

نازانین کلیلی ئاسمان

لە گیرفانی خۆماندایە!

* * *

هاتن،هاتن، کۆسە هاتن.

بن زمانیان

هەزار و یەک زوڕنای تیایە،

گوێتان بگرن، تێ نەکەون.

پەیژەکەیان

دەندەی ڕووتی برسییەکانە،

ئاگاداری سەربانان بن، سەرنەکەون!

* * *

هاتن، هاتن، کۆسه هاتن.
ئەگەر دەرگەیان ڕاهەژاند،
مناڵەکان فێر کەن بڵێن:
بۆن دێ... بۆنی بێگانان دێ...
بۆن دێ... لە عەرد و بانان دێ!

١٩٧٣ ـ هەولێر

## ئەوپەڕی تینوێتی

ماچت دەکەم.

ئەی گیانی خۆم، ماچت دەکەم:

قۆرتی چەناگەت ماچ دەکەم،

نەرمانی گوێت،

گۆی مەمکەکانت ماچ دەکەم...

* * *

زۆر تینووتم،
لە گەڵ ئەوەی چاک دەزانم
مەمکەکانت، وەک تۆپەخوێ،
تا ماچیان کەم
نەمامی زەردی تینوێتی
لە ئێسکمدا پتر دەڕوێ!

* * *

ئەی گیانی خۆم!
لە یەکەم کۆرسی ئەڤیندا،
مەمکەکانت فێریان کردم
ڕێزی بەفری کۆسار بگرم.
چاوەکانت فێریان کردم
ڕێزی کانیی بنار بگرم.

* * *

دەمەوێ بگەڕێمەوە
بۆ سەر تەختەی قوتابخانە،
چاوەڕێت کەم،
لە دووەم کۆرسی ئەڤیندا
فێرم بکەی مەمکەکانت بپارێزم،
فێرم بکەی چاوەکانت بپارێزم.

١٩٧٣ ـ هەولێر

## بۆم نانووسرێ

بۆم نانووسرێ.

بە خوێن نەبێ بۆم نانووسرێ -

نووکی ڕمەکانتان تیژکەن،

خەنجەرتان سواری هەسان کەن،

سەرانسەرم با ببێتە کێڵگەی برین...

من ڕاهاتووم

خوێن بکەمە مەرەکەبی شیعر نووسین.

١/٦/١٩٧٣ـ خاڵس

# دەنگی ڕادیۆ و ڕەنگی شۆسە

ڕۆژێک لە ڕۆژان مانم گرت.
شەقامەکان زۆر تاسەیان دەکردم و
بەدوای هەنگاوما دەگەڕان!

* * *

دوگمەی ڕادیۆم بادا و ڕامگرت:
لەگەڵ ( کورتەی دەنگوباس ) دا،
خەیاڵم ئەستێرەکانی
وەک گوڵ چنین.
کە درێژەی بە ( کورتە ) دا،
دەمی هەژاران گەیشتە
شانەی هەنگوین.
کە ژوورەکەی خۆم بەجێهێشت،
سەگ و مرۆڤ
شۆسەکەیان ڕاخستبوو،
کەوتبوونەوە خەوبینین!

١٩٧٣ ـ هەولێر

## بۆ بازرگانان

به شەوانی ڕەسپوتین و
گەنجینەکەی قاروونەوە خەو ببینن؛
بە کورسییەکەی ناپلیۆن و
یاداشتەکەی خوێنڕشتنی
ئەوینداری بێستوونەوە خەو ببینن.

منیش، لێرە،
لەناو دڵی زنجەکەمدا،
بە مناڵە قژزەردەکەی دەم ئاسۆوە
خەو دەبینم؛
بە ئاگردان و پشکۆوە،
بە درەخت و بە چرۆوە،
بە قوژبنی ئەشکەوتێکی سەربەخۆوە
خەو دەبینم.

* * *

دوا دەنگوباسم ئەمەیە:
من شێت دەبم!
کە شێتیش بووم،
لەناو گەرمەی ئاهەنگێکدا،
شرینقەیەک لە تەرمی ڕاستی دەدەم و
لەسەر پشتی تاتەشۆری چەپڵەکانتان
زیت و زیندووی دەکەمەوە!

دوا دەنگوباسم ئەمەیە:
من شێت دەبم!
کە شێتیش بووم،
لە گۆڕەپانێکی شاردا،
وەک منداڵێک
بە زەنگیانەی درۆکانتان یاری دەکەم!

۱۹۷۳ - هەولێر

## بۆ شاعیران

هەر وشەیێ،
وەک گوللەیێ،
بۆ تفەنگی ئازادیخواز بەکار نەیێ؛
هەر وشەیێ،
وەک دێمکەیەک ئاوی باڵدار،
وەک نووردییەک نانی باڵدار،
نەفڕێ لەبنکەیەکەوە بۆ بنکەیێ:

چاکتر وایە،
ئەو وشەیە
چەکمەی دوژمن بسڕێتەوە، وەک فلّچەیێ.

* * *

من خۆشەویستێکم هەیە.
کە زمانی خێو و جنۆکە نازانێ:
وەک منالّێک نامەی سادەم بۆ دەنووسێ.
وەک منالّێک تێم دەڕوانێ.

* * *

ناهێلّم تەم
گەمارۆی شارەکەم بدات.
تا هیچ نەبێ
خۆشەویستی خۆم تێم بگات!

* * *

سادەم.
بەڵێ، سادەم!
سادەم و هەر سادەش دەبم،
وەکوو ناوی نیشتمانم:
ئەو عەبایەی
دوێنێ لەبەر خۆشەویستی خۆم کردەوە
نایکەمە بەر شیعرەکانم!

١٨/٧/١٩٧٣ ـ کوردستان

# کێ بێ لە من ماندووتر بێ؟!

کێ بێ لە من ماندووتر بێ؟!
من خۆشەویستێکم هەبوو،
وەکوو دڵۆپە فرمێسکێک
لە گلێنەی چاوەکانما قەتیس مابوو.
لە ڕۆژێکی بەهاری ساڵی حەفتادا
لە چاوەکانم جیا بۆوە.

لەو ڕۆژەوە تاکوو ئەمڕۆ
من دێوانەی
ئەو دڵۆپە فرمێسکە بێ سەروشوێنەم.
هەر چەند دەکەم، جارێکی دی،
بۆم ناکرێ بیگێڕمەوە ناو گلێنەم

* * *

کێ بێ لە من ماندووتر بێ؟
من خۆشەویستێکم هەبوو،
وەکوو هەناسەیەکی پاک
لە سینگمدا
هێلانەی خۆی چێ کردبوو..
لە ڕۆژێکی بەهاری ساڵی حەفتادا،
وەک باڵندە
تۆرا و سییەکانمی بەجێهێشت...
لەو ڕۆژەوە تاکوو ئەمڕۆ

هەرچەند دەکەم، ئاخ، ناتوانم
ئەو هەناسە ئاوارەیە
بدۆزمەوە...
کۆی کەمەوە...
بیگێڕمەوە ناو سییەکانم!

١٩٧٣ ـ-کوردستان

# ئەگەر هاتی تەنیا وەرە

ئەگەر هاتی تەنیا وەرە!
ئەو بارانە پەستم دەکا
کە ڕەشەبای لەگەڵدا بێ.
پەست دەبم بەو گوڵەگەنمەی
لەگەڵ ژەنگا
پەنجەیان تێک هەڵکێشابێ!

* * *

ئەی بارانی ساڵی نەهات:
ئەگەر هاتی تەنیا وەرە!
بێ ڕەشەبا و بێ دەنگ وەرە.
ئەی گوڵەگەنمی زێڕکفتم:
ئەگەر هاتی بێ ژەنگ وەرە.

* * *

ئەگەر هاتی تەنیا وەرە،
هەروەک لەناو دڵما تەنیای.
سەرینەکەم بۆ دوو کەسە،
دوو کورسیی تامەزرۆم هەیە،
دوو پیاڵەشم هەیە بۆ چای!

* * *

کاتێ بە تەنیا دێیتە لام،
مەمکی دایکم
سواری پشتی چیاکان دەبێ،
چیاکانیش دێن،
دەرگەی ژوورە خەمگینەکەم دەکەنەوە،
ناوچەوانی دەرکراوم
ماچ دەکەن و دەیسڕنەوە.

١٩٧٣/٩/١١ ـ ڤەڕۆنێژ

# بۆ نێرگزێکی کێویلکە

درەختەکانی ڤەرۆنێژ #
وەکوو کیژە کوردی لادێ،
شەرم دەکەن ڕووت ببنەوە،
هەرچەند هەوای پایزیشیان بەسەردا دێ.

* * *

ئەی نێرگزە کێویلکەکە!
تۆ شارەزای جادەکانی
ئەم شارە غەریبەت کردم.
بۆ بەر تیشکی چرای کزی
هەموو باخە پڕ نهێنییەکانت بردم.
کۆڵان کۆڵان،
داڵان داڵان،
هەمووی گەڕاین.
کۆگا کۆگا،
ڕێگا ڕێگا،
هەمووی گەڕاین.
کام سووچ تاریک و نووتەکە،
لەوێ... خۆمان کرد بە چرا و
تیا داگیرساین!

* * *

نێرگزە کێویلکەکە،

باس بۆ تۆ!

ئارەزای جادەکانی

شارە غەریبەت کردم.

باس بۆ تۆ!

ەر تیشکی چرای کزی

وو باخە پڕ نهێنییەکانت بردم.

م، توخوا، لێم ببوورە

ر بلێم ڕێگەی دڵت پێ نازانم،

چوار پەنجە لە من دوورە!

۱۹۷۳/۹/۲۱ ـ ڤەرۆنێژ

---

نێژ: شارێکە، دەکەوێتە سەر ڕووباری ڤەرۆنێژ، لە
ەی ڕووسیا. شاعیر ساڵی خوێندنی ۱۹۷۳-۱۹۷٤/ی
بەسەربردووە.

## كودەتا

پێش تۆناسین
منداڵێکی خۆپەرست بووم:
وام دەزانی،
ئاسمانی پان دەوارێکە،
تەنیا بۆ من هەڵدراوە.
زەوی دوورگەی دوای تۆفانە،
جگە لە من، هیچ کەسێکی تیا نەماوە.

ئەوینی تۆ لەپڕ هات و
شووره و قەڵامی خاپوور کرد،
ڕەنگەکانی هەموو گۆڕین،
یاساکانی ژێروژوور کرد.
وای کرد دنیا
بۆ تەنیاییم وەک قەفەس بێ.
فێری کردم -
شەوان نیو سەرینم بەس بێ!

١٩٧٣/١٢/١- ڤارۆنێژ

# دەریان کردم

دەریان کردم.
چونکە شیعرم،
منالێکی چەتوون ئاسا،
پلووکەبەردی هاوێشتە
ماڵی شووشەبەندی گەوران!

دەریان کردم.

چونکە شیعرم هێڵی بەزاند:

لە ڕووی گەنجینەی دزراوا

گڵۆپێکی

دە هەزار ڤۆڵتی داگیرساند!

٨ /١٢/١٩٧٣ ـ ڤەڕۆنێژ

## لێت نەگۆڕێ

کەزیت چەپکە ئاگرێکە،
هەموو ڕۆژێ دەڕژێتە ناو ژووری تارم.
وا هەست دەکەم،
ڕۆژێک دادێ... لافاوی ئاگر هەڵدەستێ.
زەردەخەنەت کەشتییەکە،
هەموو ڕۆژێ ڕێ ون دەکا،
وا هەست دەکەم، ڕۆژێک دادێ
لە بەندەری دڵی مندا ڕادەوەستێ!

* * *

نهێنیی خۆم
تا ئێستا بە کەس نەگوتوە،
بە تۆی دەڵێم:
من چیاییم،
خەڵکی شاری ( ئەستی ) کوژەم... #
هەموو ڕۆژێ
خوێنی زینێک لە خەنجەرم دادەچۆڕێ.
گەر دێیتە لام، وریای خۆت بە،
خۆشت نەوێم، لێت نەگۆڕێ!

١٩٧٤/٩/١٣ ـ مۆسکۆ

---

# ئەستی( ستی ) کچە کرمانجێکی دەشتی هەولێرە. لە چلەکاندا لەگەڵ کەریمی ئەوینداریدا سەری خۆیان هەڵدەگرن. گەلێک ئەم گوند و ئەو گوند، ئەم ماڵ و ئەو ماڵ دەکەن، کەس خۆیان لێ بە خاوەن ناکا، تا لە نێزیک گوندی حەسارۆکان هەردووکیان، بە دەستی بابی ئەستی و ئاغاکەی، شەهید دەکرێن. گەلێک لاوک و حەیرانیان پێدا هەڵگوتراوە.

## خەو

سندمیان کردە هەردوو پێم،
کەلەپچەیان کردە دەستم،
خەنجەر نیشتە سەر گەردنم،
لێیان پرسیم:
ناوی چییە خۆشەویستم.
بێ دەنگ وەستام وەک سەنگی مت،
دامە قاقای پێکەنین و هیچم نەگوت!

* * *

چاویان کوڵیم،
سەریان بڕیم،
بە خەنجەر دڵیان شەق کردم،
خوێنم وەکوو هەورەتریشقە
شریخاندی و هەر نەمردم.

* * *

کاتێ خوێنم فڕکەی کرد و
وەکوو چەپکەگڕێک پژا
بەسەر عەردا،
جەللادەکان
هاتن... پەنجەیان تێوەردا
هاتن... چیلکەیان تێوەردا:

پیتی ناوێکی سەربڕاو،

نەخشەی وڵاتێکی دزراو،

تێکەڵاو بوون وەک تانوپۆ.

یەکاڵایان نەکردەوە،

هەرچەند پەنجەیان تێوەردا،

هەرچەند چیلکەیان تێوەردا!

١٩٧٤/١٠/١٧ ـ مۆسکۆ

## چەند وشەیەک
## دەربارەی تەمەنی خۆم

بۆ «ڤ. ن»

کاتێ ڤالیا لێم دەپرسێ:
« کەی پێت نایە ئەم دنیایە؟»
پێکەنینم، وەکوو چووزەرە ڕێواسێک،
لەژێر بەفری دەم و لێوما سەر دەردێنێ.
پێکەنینم ـ گریانێکە،
زەردەخەنەی هەموو دنیا دەگەچڵێنێ!

* * *

بەڵێ، ڤالیا!
نیاندرتاڵ بووم
کاتێ پێی خۆم نایە دنیا.
بە چاوی خۆم
چاخی هەموو پێغەمبەرەکانم دیوە.
کاروانی مێژووی شەرمەزار
بە سەر لۆچی ناوچەوانما تێپەڕیوە.
کەچی هێشتا...
ئۆفیسە قۆڵبڕەکانی
ئەم چاخە ویژدان تۆپیوە
لە دەفتەری زیندووواندا
ناوی منیان نەنووسیوە!

١٩٧٤/١٠/١٩ ـ مۆسکۆ

# تاڤگە

(بۆ تاڤگەی برازام)

تاڤگە، کاریلەی مامی خۆت!
تۆ جاران تەنیا تاڤگە بووی،
ئەمڕۆ لای من گەورەتری.
ئەمڕۆ لای من ئەلبۆمێکی،
وێنەی هەموو منالآنی
کوردستانم بۆ هەڵدەگری.

* * *

تاڤگە،

ئەی سمۆرە کێویلکەکەم!

چ دەکەی لە مۆسکۆ، لێرە؟

چ سیمرخێک

تۆی بۆ من گەیاندە ئێرە؟

چەند ڕۆژێکە

لە ناو پۆلی منالاّندا

دەتبینم خەریکی یاریت.

کە زریزەی بەفری زیوین

زەوی و ئاسمان لێک دەدووریّ،

لە گەلّ بەفرا تۆش دەباریت.

کە دەست دەبەم بۆ کتێبێک،

تۆ، وەک جاران،

تۆتکە ناگری... پەستم دەکەی.

ساپساپانێ
بە پیتەکانی کتێبی دەستم دەکەی.
دەچمە ناو واگۆنی میترۆ ـ
تۆ وەک ڕێگەی گەڕانەوەم
لە بەر دەممای.
شەقام دەبڕم ـ
وەک سێبەری
چێشتەنگاوی درەنگی خۆم
تۆ لە تەکمای.
جارجار خۆمت لێ ون دەکەم ـ
کەچی لەپڕ
وەک ڕۆژنامە لەناو دەستمای!

* * *

تاڤگە،
ئەی سمۆرە کێویلکەکەم!

تۆ جاران تەنیا تاڤگە بووی.
ئەمڕۆ لای من گەورەتری...
ئەمڕۆ لای من ئەلبۆمێکی
وێنەی هەموو منالآنی
کوردستانم بۆ هەڵدەگری!

زستانی ١٩٧٤ ـ مۆسکۆ

## فوتبۆڵ

ئاژانسەکانی دەنگوباس ڕایانگەیاند:
یارییەکی فوتبۆڵ دەکرێ.
دوو تیپەکە ـ کرێمل و کۆشکی سپی.
تۆپ ـ سەری کورد.
گۆل ـ کوردستان.
تەماشاکەر ـ دنیای کڕی وەک گۆڕستان!

٣/١١/١٩٧٤– مۆسکۆ

## بەفر

وەک (جوانی بێ ناو) ی گۆران،
وەک ڕۆژانی ساڵی بەفەڕ،
وەک ساڵانی تەمەنی تەڕ،
وەک گەندەپەڕی باڵدارێ،
وەک فرمێسکی زارۆی ساوا،
وەک هەنگاوی بەرەبەیانی ڕێبوارێ،
کلوو کلوو، هێدی هێدی،
بەفری زیوین دێتە خوارێ.

۱۰/۱۱/۱۹۷٤ـ مۆسکۆ

# چەند وشەیەک
# دەربارەی دڵی خۆم

ئەم دڵەی من
وەک واگۆنی قیتارێکە ـ
هەزار و یەک وێستگەی هەیە.
لە هەر یەکێک لەو وێستگانە ڕابوەستێ،
ڕێبوارێک بەجێی دەهێڵێ،
ڕێبوارێک خۆی تێدەپەستێ.

بەلام وەتی ئەم دڵەی من بۆتە واگۆن
ڕێبوارێکی پەستی تیایە،
دانابەزێ،
دانابەزێ
لە سووچێکی ئەم دنیایە.
ئەو ڕێبوارە بەدوای ناوی خۆیدا وێڵە...
ئەو ڕێبوارە بەدوای چاوی خۆیدا وێڵە...
ئەو ڕێبوارە برینمە.
ئەو ڕێبوارە زەردەخەنە و گرینمە.
ئەو ڕێبوارە کوردستانە،
لانەی یەکەم ئەڤینمە.

۱۹۷٤/۱۱/۲۲ ـ مۆسکۆ

# ڕامانێک

گیانە، دەڵێن:
« ئەمساڵ ساڵی بەفر و خوێنە»
بۆیە...
کاتێ نیگام دێتە شنە
لەسەر سێوە لاسوورەکەی ڕوومەتی تۆ
بیری من و بەفر و خوێنی ئەم زستانە
تێک دەئاڵێن وەک تانوپۆ.

٢٦/١١/١٩٧٤ـ مۆسکۆ

## بۆ مۆنیکا بۆرگوارد

نەتالیای شۆخ #

لەناو زەریای مەرەکەب و

خوێنی بێبنی پوشکیندا

ماسییەکە،

نە خەم دەخوا، نە پیر دەبێ،

نە چەنگاڵی مەرگی ڕاوکەر

لێی گیر دەبێ.

ئێلزاش هەتا دنیا مابێ #
شاژنێکە،
کەژاوەکەی
لەسەر شانی شیعرەکانی ئەراگۆنە،
بەسەر هەر پێنج کۆنتینێنتا ڕادەبووری،
وەک تووڕەیی چیاکانی من،
وەک بەستەکانی کۆمۆنە#

ئەی مۆنیکا!
نەتالیام تۆی.
ئەی مۆنیکا،
تۆی ئێلزام، تۆی!
لە ساتێکدا، کە دڵتەنگیت،
گەر بە من بێ،
گۆی زەوی دەکەم بە سێوێ،
دەیدەمە تۆ
یاریی پێ بکەی وەک منالێ.

كە سەرما هات،
لەچەكت ويست،
ئاسمانی شین دادەگرم و
بۆتی دەكەم بە دەسماڵێ!

* * *

من دەمەوێ تۆ نەمر بیت!
من دەمەوێ
ئێوارەیەك
لەگەڵ هەورا بباریت و تەواو نەبیت.
من دەمەوێ
سپێدەیەك
لەگەڵ ڕۆژا بۆم هەڵێیت و ئاوا نەبیت.
بەڵام، سەد ئاخ!
من پوشكین نیم.

ئەراگۆن نیم.
دەزانی کێم؟
دەزانی چیم؟
من چلێکی بەژنچەماوەی شەنگەبیم.

* * *

مۆنیکای خۆم، نەتالیاکەم!
مۆنیکای خۆم، ئەی ئێلزاکەم!
بڕوا بکە،
هەزار جاریش
پەساپۆرتی جاویدانیت بۆ ئیمزاکەم،
لە نێزیکترین سنوورا
پۆلیسەکان،
دوای سەرنجێکی شێتانە،
مەمکت دەبڕن،
ئەوسا لەسەر قاپێک شەراب

ئەنیت دەکەن بە نیشانە.

هەموو هۆیەکەش ئەمەیە:

پاسپۆرتەکەت

نەخشی بەنجەی شاعیرێکی

بێ نیشتمانی پێوەیە!

١٩٧٤/١٢/١٦ ـ مۆسکۆ

---

# **نەتالیا گەنکیرۆڤە:** هاوسەری ژیانی شاعیری گەورەی ڕووس ئەلێکساندەر پوشکینە

# **ئێلزا تریۆلی:** هاوڕێی ژیان و سەرچاوەی ئیلهامی شاعیری ناوداری فەرەنسایی ئەراگۆنە

# **کۆمۆنە:** مەبەست لە کۆمۆنەی پاریسە (١٨٧١ ز) کە بۆ ماوەیەک ڕەشوڕووتانی پاریس دەسەلاتیان وەرگرت.

## من و ئەو و شیعر

دەمخوێندەوە...
هێدی هێدی،
بێشکەی ئاڵی خەونەکانیم ڕادەهەژاند.
وشەکانم،
لەنێوانی زاری من و گوێچکەی ئەودا،
جۆگەی ئاگریان هەڵدەبەست.

ئەویش وەکوو منداڵێکی وڕکگرتوو،
بڕۆکانی گرێ دابوو،
سەرپەنجەکانی خۆی دەگەست!

* * *

بۆم خوێندەوە.
دوا هۆنراوەی دەفتەرەکەم بۆی خوێندەوە.
گوێم لە پرمەی گریانێک بوو!
- بۆچی دەگریت؟
+ «وەک هەر کچێ، چاوەڕێ بووم
لە شیعرێکدا خۆم بەدی کەم،
دڵم پڕ گڕ، پڕ هیوا بوو...
کەچی چوومە بەر ئاوێنەی هەر شیعرێکت
جیوەی سووابوو!»

مۆسکۆ - ١٩٧٥/١/٨

## شیعر

تادێ شیعرم خۆشتر دەوێ،
چونکە شیعر وەک شۆخێکی دوودڵ وایە ـ
هەموو ڕۆژێ
جێ و کاتی ژوان نیشان دەکەین،
بە دەگمەن دێ... یا هەر نایە!

١٦ /٢/١٩٧٥ ـ مۆسکۆ

## ڕەشەبای دەنگوباس

وەک چۆن پەڵە هەورێکی پڕ
کەوتبێتە بەر نەقیزەی بایێکی وڕ؛
وەک چۆن بەرخێک
گورگێکی هار لە هەناویا بلوورێنێ؛
وەک چۆن تاکە هەوێردەیەک
هاشەی باڵی باشووکەیەک
ئاسمانی لێ بگەچڵێنێ:

منیش ئاوام!
خول دەخۆمەوە بێ قۆناخ،
پێڵاوی پێم
پڕی وردەشووشە و پشكۆن،
شاری مۆسكۆ دەستنووسێكە،
لێ... بە خەتی بزماریی كۆن!

* * *

ناوچەوانم ـ ڕۆژنامەیە،
بە هەر زمانێک دەردەچێ.
بە خۆڕا دەخوێندرێتەوە،
خۆی بەپیر خەڵكەوە دەچێ.
سیمام ـ پەردەی سینەمایە و
ڕیزە فیلمێک نیشان دەدرێ:
« ڕۆما مەقەڵەی نیرۆنە »

« هیرۆشیما کارگی گڕی دەرخوارد دەدرێ »

« کوللە دەگاتە شارەزوور »

« سێدارەیەک لە چوارچرا

« چرۆ دەکات و گوڵ دەگرێ... »

* * *

ئەی منالّە قشتەکانی

پێتەختی ئەشق و کارگە و گوڵ!

ئەمرۆ لە چاوم سڵ بکەن،

سڵ بکەن... سڵ!

چاو بێپەردە و زمانشڕە،

زۆر دەترسم وەک وەرگێڕێ

لە زمانی داربەڕووەوە

خەم بۆ شەتڵەبریۆزەکان وەربگێڕێ.

* * *

ئەی کچانی
پێتەختی عەشق و کارگە و گوڵ!
ئەمڕۆ سنگم
نە ئێوەی تیا ماوە نە دڵ!
وەک بیستوومە،
لە چیاکانا ڕەشەبایە...
نا، ڕەشەبا لەوێ نییە!
ئا لێرەیە،
لە لانکۆڵەی دوێنێ و سبەی ئێوەدایە.

١٩٧٥/٤/٩ ـ مۆسکۆ

(١)

ئەگەر ئەمجارە بێمەوە:

بەیانییان،

وەک بەرخۆڵەیەکی ساوا،

لەناو قەرسیلی پاراوا

تل دەخۆم و

گیایەکی تفت... تێرتێر دەجووم،

تا کفت دەبم،
پێ و بەلەکم
لە شەونمی سارد هەڵدەسووم!

* * *

ئەگەر ئەمجارە بێمەوە:
وەک سمۆرە،
بە دارگوێزە بەرزەکانا هەڵدەگەڕێم،
وەک پەڵەیەک هەوری نەوی
بەسەر کێڵگە سەوزەکانا دەخولێمەوە،
وەک شەنگەبی
بەسەر چەما،
بەسەر گشت زنارەکانی
کەنارا ... دەچەمێمەوە،
ئاخ، بەس ئەمجارە بێمەوە!

* * *

ئەگەر ئەمجارە بێمەوە:

سەرنج دەدەم

گوڵەگەنم چۆن زەرد دەبێ،

هەنار و سێو چۆن پێ دەگەن،

قەتێیەکان

هێلانەیان چۆن چێ دەکەن!

سەرنج دەدەم،

زەرنەقووتە چۆن باڵ دەگرێ،

پەڕەسێلکە کۆچەرەکان،

لەسەر تێلی کارەبای ڕێ ،

چۆن ڕیز دەبن،

جۆگەلەکان لە کوێوە دێن،

بۆ کوێ دەچن!

* * *

ئەگەر ئەمجارە بێمەوە:
لە گۆی مەمکی هەر کانییەک
قومەئاوێک دەخۆمەوە،
گشتیان دەکەم بە دایکی خۆم.
لە هەر ئەشکەوتێکا، شەوێک
سەر بە گاشەبەردێک دەکەم،
گشتیان دەکەم بە لانکی خۆم.

* * *

ئەگەر ئەمجارە بێمەوە:
زمانی گڕ دەهێنمەوە بۆ لاڵەکان.
شاپەڕی گڕ دەهێنمەوە
بۆ فڕندە بێباڵەکان!

* * *

ئەگەر ئەمجارە بێمەوە:
ناهێڵم لاوان گوڵ بچنن
بۆ گوڵدانی مردووی سەر مێز.
فێریان دەکەم،
کە چوونە ژوان،
لە بەرۆکی کچانی دەن،
ئەوسا بیان کەنە ئامێز!

* * *

ئەگەر ئەمجارە بێمەوە
- منالآنی مۆسکۆی چاوشین فێریان کردووم -
بێ شیرینی
سەر ناکەم بە هیچ مالێکا،
زۆر جۆلانەی نەرم و سادە
بۆمنالآن هەڵدەبەستم.

لە جەژنی  لەداکبوونیانا
ـ کە نییانە ـ
بەشدار دەبم...
لەباتی مۆم دادەگیرسێنم ئەنگوستم.
گڕ بەردەدەم
لە گلێنەی چاوەکانم،
لە ساواترین هەڵبەستم.

* * *

ئەگەر ئەمجارە بێمەوە:
هەر بێشکەیێک بێتە ڕێگەم،
بە شێنەیی بە سەریا دەنووشتێمەوە.
ئاخ، منالآن!
ئاخ، بەس ئەمجارە بێمەوە.

١٩٧٥/٥/١٦ ـ مۆسکۆ

( ٢ )

ئەی دایە گیان!
لە یادمە، کە منداڵ بووم،
ئەشقی تامی تفت و تاڵ بووم:
گڵم دەخوارد،
قوڕم دەجوی،
تۆش زللەیەکت لێ دەدام،
هەمووت پێ تووڕ فڕێ دەدام.

ئەی دایە گیان!
ئێستا گەورەم و منداڵ نیم،
ئەشقی تامی تفت و تاڵ نیم،
کەچی ئەگەر ئەمجارەشیان

ڕێم بکەوێتەوە بێرکۆت#

لێشم بدەی،

لێشم حەرام کەی شیری خۆت،

من بە تەشییەکەی منالّی دەڕێسمەوە:

دار، بەرد، گڵ، قوڕ...

چیم بێتە ڕێ دەیلێسمەوە!

۱۹۷٥/۱۲/۱۷ ـ مۆسکۆ

---

بێرکۆت: جاران گوند و ئێستا گەڕەکێکی شاری هەولێرە، زێدی شاعیرە.

## بەسەرهاتی فلیمێك

فلیمەکە تراژیدیا بوو.

ناوەرۆکی - مان و نەمان.

بەرامبەری پەردەی سپی

دڕیان بە بێدەنگی دەدا زەنگی دڵان.

چاو چەخماخەیان لێ دەدا،

لەناو جەرگی تاریکیدا

ملیۆنەها دادەگیرسان!

پاڵەوانی فلیمەکە
لەگەڵ کزەی زەردەپەڕدا
تیشووی هەڵگرت،
ڕابرد بە ناو
دڵی تاری شەوی کەڕدا.
بەڵێنی دا
ئاسمانی شین،
چەمی زیوین،
ئاگردانێکی پڕ پشکۆ،
ساپیتەیەکی سەربەخۆ
بۆ قەرەجان دەسگیر بکات.
کەچی، لەپڕ،
خەنجەری خۆی پشتی پێکا،
فلیمەکەش... لە ناوەختا کۆتایی هات.

* * *

منم پەردەی سینەماکە.
منم هۆڵی سینەماکە.
من دەزانم
ئەکتەرەکان تاوانبار نین.
من دەزانم
بینەرەکان تاوانبار نین.
بۆیە ئێستا
لە ئەکتەرە بەڕێزەکان داوا دەکەم،
لە بینەرە بەڕێزەکان داوا دەکەم،
نارەزایی نیشان بدەن
بەرانبەر بە گیرانی خۆر...
بەقەد خوێنی قوربانییەکە
تف هەڵاوێن
بۆ ناوچەوانی ڕێژسیۆر.

٢٠/٥/١٩٧٥ ـ مۆسکۆ

# بۆ جوانێکی سارد

دانی پیادەنێم: تۆ جوانی،
وەک دڵۆپەشەونمێکی سەر پەڕەی گوڵ.
پەرستگەی چاوی هەموانی،
وەک دڵۆپەشەونمێکی سەر پەڕەی گوڵ.
کەچی لێم بوویت بە پەساپۆرت،
لەگەڵمایت و لێت بێزارم:

من چیاییم،
ختووکەیەک
وەک گڕ خوێنم دێنێتە کوڵ.
دەبینم تۆش ساردوسڕی،
وەک دڵۆپەشەونمێکی سەر پەڕەی گوڵ!

١٩٧٥/٦/٤ ـ مۆسکۆ

# ناکەوین

ئێمە وەک درەختین ـ
جار هەیە دەخەوین.
دەخەوین وەک شوانی دوای شەوین.
بەڵام لە خەویشدا... بەپێوەین،
بەپێوەین، ناکەوین!

١٩٧٥/٧/٨ ـ گوندی ئیگومینکە

# خەون

- « خەوم نایێ.
دەترسم برۆم ونت کەم.
خەوم نایێ.
ڕۆژانمان - ئەوانەی ماون -
بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن،
چەند دڵۆپە شەونمێکی بەرهەتاون.
دەترسم برۆم ونت کەم.
خەوم نایێ.»

+« بنوو، گیانە!
بیر لە دەریایەک بکەوە،
کە هێندەی چاوی خۆت مەنگ بێ.
بیر لە ئاسمانێک بکەوە،
هێندەی ژانی من بێدەنگ بێ.
خەم مەخۆ، هێمن بە، بنوو...
دوێنێ خەونێکی خۆشم دی.
لە خەونمدا
مرۆڤ هەزار دەستی هەبوو.
هەر دەستێکیش، وەک درەختێک،
هەزاران پەنجەی گرتبوو! »

۱۹۷٥/۷/۱۱ ـ ئیگومینکە

## ئەلبۆم

ـ « گفتت دامێ،
وێنەی ئەوانەم نیشان دەی،
کە مۆم ئاسا
لە شەوگاری ژینتا هەڵبوون؛
هی ئەوانەی خۆشت دەوێن،
هی ئەوانەی خۆشت ویستوون.»

+« لەو ڕۆژەوە گفتم داوە
لە سۆراخی ئەلبۆمێکدام،
کەوا دوو تۆی
وێنەی هەموو ئافرەتانی ئەم جیهانە
بگرێتە خۆی! »

١٩٧٥ ـ مۆسکۆ

## پێشبینی

من فاڵچی نیم.
کتێب بۆ کەس ناگرمەوە.
ناولەپی کەس ناخوێنمەوە.
کەچی لێم ڕوونە و دەزانم:
مادام تۆ منت خۆش دەوێ،
دەبیت بە نەرمەبەستەیێک،
قەرەجەکان...
شەوانی زستان دەتبێژن.

دەبیت بە دێڕەهەڵبەستێک،
بەیانییان ڕۆژ دەتنووسێ،
کە زەردەپەڕیش دەکەوێ
شیعرکوژەکان دەتنێژن.

١/١١/١٩٧٥- مۆسکۆ

## زستانی پار...

زستانی پار لەگەڵما بووی -
لەم شارەدا
بەستەڵەکیش
گوڵمێخەکی لێ دەردەچوو.
تا چلوورەش
بە گوێسوانە و درەختەوە سەوز دەبوو.

* * *

زستانی پار لەگەڵما بووی:
باران تەڕی نەدەکردم.
زریان پەنجەی نەدەبردم.

* * *

زستانی پار لەگەڵما بووی:
هاژە و خوڕەی زێی سیروانم
لەگەڵدا بوو.
گوڵەگەنمێکی گەرمێن و
کلوەبەفرێکی کوێستانم
لەگەڵدا بوو!

١٩٧٥ـ مۆسکۆ

## بۆ چاوڕەشێکی باکۆیی

جار هەیە تاکە وشەیێ

دەتکێتە ناو چاوی شیعرێ،

تا سەرچۆپی

بۆ وشەکانی تر بگرێ.

* * *

تۆ پەیڤێکی باڵندە بووی،
ڕەشەبای گێژی ئێوارە
شەوارەی کردی و ڕاپێچای
بەرەو شیعری سیسەهەڵاتووم.
چاوی ڕەشت
مانای بەخشی بەو چاوانەی،
پێش تۆناسین،
وەکوو وێستگە پیانا ڕەتبووم!

۱۹۷٥/۱۲/۱۳ـ مۆسکۆ

# نامۆیی

که نامۆیی وەک ڕەشەبا هەڵدەکات و
پێدەشتی ئارامم دەبڕێ،
که خەم وەکوو قەلەڕەشکە،
له بەردەرگەی ژوورەکەمدا،
باڵەکانی دەکاتەوە و لەنگەر دەگرێ:
من چۆلەکەی باڵتەزیوی
خەمەکانی خۆم هەڵدەگرم،

دەڕۆم، دەڕۆم،
تا منالێک دەدۆزمەوە،
لەناو تیشکی چاوی ئەودا
فڕین وەبیر چۆلەکەی خەم دەهێنمەوە.

کەچی، گیانە!
بە چاوی خۆم زۆر جار دیومە
کە منالان
لەم شارەدا خەفەت دەخۆن،
وەکوو بێچوە مراوی دێن
لە زەریاچەی چاوی تۆدا خۆیان دەشۆن.

٢٧/١٢/١٩٧٥- مۆسکۆ

# لەو ڕۆژەوە لەگەڵما نیت

لەو ڕۆژەوە لەگەڵما نیت
سبەینان خۆر درەنگ هەڵدێ.
ئەستێرەکان
چاوی دایکی شەهیدانن ـ کز دەسووتێن.
کێشوولەکان
لەسەر شیشەی پەنجەرەکەم هەڵناکورمێن.

* * *

ئەگەر هاتو ونم کردی،

ئەگەر هاتو... ئەم جیهانەی پان و بەرین

لەژێر ساپیتەی زنجێکدا

بەیەکەوەی ڕانەگرتین:

کە گەڕامەوە کوردستان،

من تینوێتیم هەر بە ئاوی کانی دەشکێ -

کانیی هەموو بنارانت بەناو دەکەم.

کارمامزم زۆر خۆش دەوێن -

کارمامزی پێدەشتانت بەناو دەکەم.

من تا مردن چیاپەرستم -

بڵندترین چیای کوێستانت بەناو دەکەم.

٢٧ـ ١٩٧٦/١/٢٨ـ مۆسکۆ

## چاوەنواڕی

چاوەڕێتم.
دەگەڕێیتەوە سوێند دەخۆم،
سوێند دەخۆم دەگەڕێیتەوە.

گەر یەک یەکیش سنوورەکان مینڕێژ بکە
بە گوللە و تیر
دنیاش دابێژ دابێژ بکەن:

هەموو ڕۆژێ،
لەگەڵ بەری بەیانیدا،
بەرەو ئاسۆ
لەدوو دەدەم دەزووی نیگام.
وا هەست دەکەم
تۆ دەبیتە باڵدارێکی ئەفسانەیی و
بەیانییەک دێیتەوە لام.

* * *

دەگەڕێیتەوە... سوێند دەخۆم.
سوێند دەخۆم... دەگەڕێیتەوە.
بۆیە ئەگەر
بست بە بستی ئاسمانیشت لێ بتەنن،
هەموو ڕۆژێ،
لەگەڵ بەری بەیانیدا،
پەنجەرەکان دەکەمەوە؛

وا هەست دەکەم،
کە تۆ وەکوو توولەنەمام
بەیانییەک
لە بەر پەنجەرەکەم دەڕوێی...
بە دیواردا هەڵدەگەڕێی...
دێیتەوە لام!

١٩٧٦/٦/٢١ ـ مۆسکۆ

## گەورە مەبە

لەگەڵ مندا گەورە نابیت.
مناڵی لێت نابێتەوە.
لەگەڵ مندا تا هەتایێ
بێ بووکۆکە خەوت نایێ!

* * *

گەورە مەبە،
کزەی جەرگم، گەورە مەبە!
تا من مابم،
لە منالّیت وەڕس نابم:
شەو سامالّ بێ،
وەک تۆ دێمە بەرپەنجەرە،
ئەستێرەی ئاسمان دەژمێرم.
کە بارانیش دەئاخڤێنی،
بە کڕوکپیت دەسپێرم!

* * *

گەورە مەبە،
کزەی جەرگم، گەورە مەبە.
دە قیڕوسیا!
بەیانییان شیر بۆ من و بنکرِ بۆ تۆ.

که ئاگرۆکه دەکەیتەوە،
دووکەڵ بۆ من و گڕ بۆ تۆ!

* * *

گەورە مەبە!
هەموو شەوێ
بە کەژاوەی هەقایەتی
ئەندرسن و شیعری مارشاک، #
خۆم بۆ خەوت بە بووک دەبەم.
که نووستیشی،
مۆر لە دەمی سرووشت دەدەم.

* * *

گەورە مەبە،
کزەی جەرگم، گەورە مەبە!

ئەگەر وەڕس بووی، پێم بڵێ،
خانووچکەی شووشەت بۆ دەکەم.
ئەگەر برسی بووی، پێم بڵێ،
چنگۆڵانت
پڕ باسووق و گەزۆ دەکەم.

* * *

گەورە مەبە،
کزەی جەرگم، گەورە مەبە.
هەموو ڕۆژێ
شقارتەیەک لە منەوە:
دەنک دەنک دایگیرسێنە...
تیشک و پرشەی چراخانی لێ بسێنە...
گەرموگوڕیی
ئاتەشگەدەی
زەردەشتیانی لێ بسێنە!

* * *

گەورە مەبە،
کزەی جەرگم، گەورە مەبە.
تا من مابم،
لە منالّیت وەڕس نابم!

١٩٧٦/٧/١١ ـ مۆسکۆ

## سێ هۆنراوە

(١)

بەڵێنی هیچت پێ نادەم.
هەر ئەوەندەم ئاگا لێیە
کە من ئێستا خۆشم دەوێی.
ئێستا وەکوو هیمۆگلۆبین
لەناو خوێنمدا دەگەڕێی.

* * *

خۆ دڵی من سارنج نییە،
دڵنیات کا،
کە تۆ تێیدا قەت ناگۆڕێی هەتا دەمرم.
تۆ مێوە نیت،
دڵی منیش کارگە نییە،
تاکوو لەوێ لە قوتووت کەم، هەڵتگرم!

بەڵێنی هیچت پێ نادەم.
هەر ئەوەندەم ئاگا لێیە
کە من ئێستا خۆشم دەوێی.
ئێستا وەکوو هیمۆگلۆبین
لەناو خوێنمدا دەگەڕێی.

١٩٧٦/٧/١٠ ـ مۆسکۆ

( ٢ )

کاتێ سەرم
دەکەمە سەر شلکەی ڕانت،
ئەی شۆڕەکچ!
ئارامترم لەو کۆترەی
لە بەرپێی پەیکەری پوشکین دەخولێتەوە
کە شلکەی ڕان سڕ دەبێت و سەر هەڵدە
تەنیاترم لەو شادێڕەی
لە شیعرێکدا شەهید دەبێ و دەکوژێتەوە

١٩٧٦/٧/١٤ ـ ئیـ

( ٣ )

ەیەکی ئاڵۆزم.

کەوتێکی ئەفسانەییم،

ڕێکم،

ەیەک بۆت دادەگیرسێم،

ورۆژێک دەکوژێمەوە.

وەکوو

گەڵی نیشتمانی تۆ.

وەکوو

گەڵی نیشتمانی تۆ.

شپەی پێی هەر پرسیارێک ناکرێمەوە.

* * *

گەر دەتەوێ
ڕووتوقووتم بکەیتەوە وەک خەنجەرێک؛
گەر دەتەوێ
ماسیی سرکی ڕازەکانم
سەر ئاو بخەی بە نیگایێ؛
گەر دەتەوێ
سنگم شەق کەی،
بیکەیتەوە وەک دەریایێ:
بمبە نێزیک داربەڕوویێ،
بمبە نێزیک لووتکەچیایێ!

١٩٧٦/٧/١٥ ـ ئیگومینکە

## دیالۆگ

- « دڵتەنگ مەبە!

ڕۆژێک دادێ دەچیتەوە.

کە چوویتەوەش،

نیشتمانت

خۆی لە بنڕا هەڵدەکەنێ.

ئامێزت بۆ دەکاتەوە،

وەک دایکت بەپیرتەوە دێ! »

+ « نا، گیانە، نا، قەت وا مەڵێ!
چۆن شتێک بەپیرمەوە دێ،
کە ئەو هەموو ساڵ و مانگە
لە بڕبڕەی پشت و خوێندا
ئەمن ئەوم هەڵگرتبێ؟! "

١٩٧٦/٧/٢٧ ـ مۆسکۆ

## وارشۆ

کفت و ماندووم.
نە چاو لە هەنگاوم دەگا،
نە هەنگاو لە چاوم دەگا.
ئاسمان
نەرم نەرم دەپرووشێنێ.
وارشۆ:
کیژۆڵەیەکی دڵتەڕە،

شەو لە وێستگەی شەمەندەفەر
لەگەڵ منا ژوانی هەیە و خۆی دەنوێنێ.
بۆیە ئاوا
لە دوێنێوە زڕخەو بووە،
قژی سەوزی خۆی تەڕ دەکا و دایدەهێنێ.

* * *

کە من هاتم، تەنیا هاتم.
کەسێک بە پیرمەوە نەهات.
کەچی کاتێ بە جێت دێڵم،
میچکێڤیچت بەڕێم دەکا #
کیژۆڵە دڵچنەکانت بەڕێم دەکەن.
مناڵە خرپنەکانت بەڕێم دەکەن.
کۆشک و تەلاری پاشایی و
بخووری کڵێسەکانت بەڕێم دەکەن!

* * *

وارشۆ،
ئەی شاژنە قژ سەوزەکە!
ئەمشەو دەڕۆم.
بێنە ماچ کەم
ئەو کوڵمەی دەیان بەهارە،
جێی ڕنۆکی
دەعبایەکی ترسنۆکی
وەک هیتلەری پێوە دیارە!

١٩٧٦/٨/١ ـ وارشۆ

---

#مچکێڤیچ: ئادەم مچکێڤیچ ( ١٧٩٨-١٨٥٥ ) شاعیری گەورەی پۆڵەندایە.

# بۆ چیایە دوورەکان

ئەی چیاییە دوورەکان!
ئێستا بڕوام نەماوە
بە هێڵی سنوورەکان،
بە مەودای نێوان دوو شوێن،
بە ئەلفوبێی جوگرافیا و
نەخشە زەرد و سوورەکان.

* * *

چۆن ئاگر کەسێک بگرێ،
منتان گرتووە وەک ئاگر -
هەرچەند بەتاوتر هەڵێم،
هەرچەند دوورتر کەومەوە،
دەبینم بڵندترن،
گەورەترن، نێزیک ترا

ماڵێک نییە سبەینان
من سەری پێدا نەکەم.
پەنایەک نییە شەوان
کە من نەیکەم بە جێژوان.

کە مناڵێکتان دەگری -
من ژیری دەکەمەوە.
نەخۆشتان خەوی دەزڕێ -
من دڵی دەدەمەوە.

ئێوە شایی دەگێڕن -
من سەرچۆپییەکە دەگرم.
ئێوە پرسە دادەنێن -
من پێش مردووەکە دەمرم.

ئەی چیاییە دوورەکان:
چۆن ئاگر کەسێک بگرێ،
منتان گرتووە وەک ئاگر.
هەرچەند بەتاوتر هەڵێم،
هەرچەند دوورتر کەومەوە،
دەبینم بڵندترن،
گەورەترن، نێزیکتر!

١٩٧٦/٨/١١ - بەرلین

## شەوبێداری

دوو بەتڵی شەو ڕاشکاوە.
بنوو، ئازیز.
هانێ لەپم سەری پێکە، هانێ بازووم.
چاوەڕێی من مەکە ئەمشەو،
من ئێشکت لێ دەگرم، نانووم.

* * *

تۆ خەوسووکی،
سروشت گرژە و هەناسەسوار:
زۆر دەترسم کە گڤەی با،
ورشەی داران،
گرمەی هەور و ڕێژنەی باران -
خوانەخواستە هەڵتسێنن،
وردە ئەڵقەی خەونەکانت
لە یەکتری بترازێنن.

بنوو، ئازیز.
هانێ لەپم سەری پێکە، هانێ بازووم.
چاوەڕێی من مەکە ئەمشەو،
من ئێشکت لێ دەگرم، ناتووم

١٩٧٦/٨/١٢ - بەرلین

# تۆش بەجێم دێڵی

« بۆ گۆرانی نووسراوە »

تۆش بەجێم دێڵی.
زۆر باش دەزانم، تۆش بەجێم دێڵی.
تۆش سەرخۆش دەبی و
وەک بادەیەکی بۆش بەجێم دێڵی.

* * *

تۆش بەجێم دێڵی.
وەک چۆن سەوزایی باخ بەجێ دێڵێ،
وەک چۆن تەمومژ شاخ بەجێ دێڵێ؛
تۆش بە جێم دێڵی.

* * *

تۆش بەجێم دێڵی.
چۆن ئەسپێکی خورت سوار بەجێ دێڵێ،
چۆن وشەی تادار... زار بەجێ دێڵێ؛
تۆش بەجێم دێڵی.

* * *

ئەگەر دەزانیت، ئەمجارە،
بڕیارەکەت دوا بڕیارە:
ناونیشانی خۆت بگۆڕە،

جێپێیەکانمان بسڕەوە
لەژێر ئاسمانی ئەم شارە.
ئەوسا، خوات لەگەڵ،
چۆن ئەسپێکی خورت سوار بەجێ دێڵێ،
وام بەجێ بێڵە.
چۆن وشەی تادار زار بەجێ دێڵێ،
وام بەجێ بێڵە!

٢٨/١٠/١٩٧٦ـ مۆسکۆ

# ئاوێنە

چەند ڕۆژێکە
سەرنج دەدەم،
بەیانییان، تا شل دەبیت،
لە بەر ئاوێنە دەوەستی و تێی دەڕوانی...
کە لاشدەچیت،
لە ڕەوتتدا ـ تەنکەخەمێک دەخوێنمەوە،
لە نیگاتا ـ نیگەرانی.

چییه، هاوڕێم؟
چیت پێ دەڵێ
ئەو ئاوێنە زمانشڕ و دڵتۆقێنە؟
ئەگەر باسی پیری دەکا،
دەمکوتی کە،
باوەڕ مەکە بە وڕێنە.

١٩٧٦/١١/١٤- مۆسکۆ

## دڵدانەوە

نیگەران مەبە کە شیعرم
بۆ کچانی تر نووسیوە -
لە ڕوخساری هەموویاندا
تەنیا ئادگاری تۆم دیوە.

* * *

دڵم تاریکە وەک تونێل،
بنەمۆمێک داگیرسێنە!
چۆن کورد بە چیاوە نووساوە،
وەرە، ئاوا ڕوومەتی خۆت
بە سنگمەوە بنووسێنە.
من دەمەوێ
بنەوشیلەی چاوەکانت دڵنیا کەم،
دەمەوێ سوێندت بۆ بخۆم:
لە تۆدا کەس بەدی ناکەم!

۱۹۷٦/۱۱/۲۹ - مۆسکۆ

# پێش هەورەتریشقە

دەتوانین وا بکەین
زستان درەنگتر بێ.
کە هاتیش،
بێ زریان...
بێ شەختە و بەفر بێ.

دەتوانین وا بکەین
دەریای هار
وەک ئاسمان هێمن بێ.
ئاسمانیش
وەک دەریا بێبن بێ!

* * *

گەر بڕیارت داوە
پەرستگە وێران کەی،
لێت ناپاڕێمەوە، کوڵـنگت بۆ دێنم.
گەر بڕیارت داوە
هێلانەکە تێک دەی،
لێت ناپاڕێمەوە،
بەردێکی پڕچنگت بۆ دێنم.
بەڵام پێش ئەوەی تۆ... کوڵـنگەکە دادەی،
هێلانەی نەرمونۆڵ... بە پلارێ ڕادەی -

پێت دەڵێم:
ئێستاش نەچووە و بچێ!
دەتوانین وا بکەین
زستان درەنگتر بێ
کە هاتیش،
بێ زریان...
بێ شەختە و بەفر بێ!

١٩٧٦/١٢/١١ ـ مۆسکۆ

## لێت ڕاهاتووم

لێت ڕاهاتووم:
وەکوو منداڵ ـ لە گۆپکەی مەم.
وەکوو ماسی ـ لە زەریا و چەم.
وەکوو شاعیر ـ لە شێتیی خۆی.
وەکوو شێت ـ لە سوژێتی خۆی.

* * *

لێت ڕاهاتووم:
وەکوو بەنگکێش ـ لە بۆنی بەنگ.
وەک نیگارکێش ـ
لە هارمۆنیا و زمانی ڕەنگ.

* * *

لێت ڕاهاتووم:
وەک خەنجەر ـ لە کالانی خۆی.
قەرەج ـ لە ئاگردانی خۆی.
وەک کیژی لادێی کوردستان ـ
لە کلچووک و کلدانی خۆی!

* * *

ئەگەر ڕۆژێک لێت تووڕە بووم،
ئەگەر ڕۆژێک بڕیارم دا جێت بهێڵم،

دڵتەنگ مەبە،

خەمت نەبێ،

درێژترین ڕێی توورەییم

لە بەردەرگە کۆتایی دێ!

٩/١/ ١٩٧٧ـ مۆسکۆ

# شەو نییە خەو بە چیاوە نەبینم

بەندییەک تاسەر حوکم درابێ،
سندم لە پێی بێ و کەلەپچە لە دەست،
لەزیندانێکی تەنگ ئاخنرابێ،
چەند سوار چاکانە
خەو بە ئەسپی شێ و باوە دەبینێ،
چەند منالانە
خەو بە ئەستێرە و گیاوە دەبینێ،

منیش، شەو نییە،
وەک ئەو بەندییە،
خەو بە هێزێکی واوە نەبینم
من بۆ چیا ببا... یا چیام بۆ بێنێ

۱۹۷۷/۳/۳ ـ مۆسکۆ

## نەورۆزی 1977

تۆ مشووری ئاگر مەخۆ.
سەرت لەسەر سنگم دانێ،
بزانە، کڵپە و نێڵەی گڕ
چ دەکا بۆ ئەم نەورۆزە!
منیش سەر بە باسکت دەکەم،
وای بۆ شەوی تاریکی وا
باسکی ڕووتت چ ئاگرێکی پیرۆزە!

٢٠/٣/١٩٧٧- مۆسکۆ

## نامە

ئێوارەیە.

باران نم نم دێتە خوارێ.

تەنیام.

نا، تەنیا نیم ـ

هەموو مۆسکۆ لەگەڵ مندا هەنگاو دەنێ.

تەنیایی ـ کارمامزێک بوو،

ڕاوکەرێک هات، تەقەی لێ کرد،

هەنگاوەکانم نایگەنێ!

* * *

ئێوارەیە.

باران نم نم دێتە خوارێ.

تەنیام.

نا، تەنیا نیم -

کاتێ دەڕۆم

شەقامی پڕ خۆی لە قاچم گرێ دەدا.

کاتێ دەڕۆم

لە گیرفانما

نامەیەکی ناو زەرفی ئاڵ

دڵی دوەممە، لێ دەدا!

١٩٧٧/٥/١ - مۆسکۆ

# با دێ

با دێ، با دێ!
ئەمیش ئاستانەی خەلیفە هەڵیکردووە و
بە ناوگەڵی
فتوای (مەلای خەتێ)دا دێ!

* * *

با دێ، با دێ!

گوێتان هەڵخەن،

چۆن داربەڕوو دەنرکێنێ!

سەرنج بدەن،

چۆن کەپکەشاخ بەلادا دێ!

* * *

با دێ، با دێ!

دەست بە ئابڕووی خۆتانەوە بگرن، خەڵکە،

ئەگەر تۆزێک ئابڕوو مابێ.

نەک هەر کڵاو،

با سەریشمان پیرۆزی با و ڕەشەبا بێ!

۱۹۷۷/٦/۲۳ـ مۆسکۆ

## بیری هەورگر

کە هەواری نامۆییم... پێ دەنێتە هەر شارێ،
ڕاوی هەوری مسینی ژانەکانی خۆم دەنێم،
بۆئەوەی بەرزەفتی کەم،
بیگوشم تا دەبارێ!

* * *

حەز دەکەم، زۆر حەز دەکەم،
قژی کچانی وارشۆ
بەهەڵبەستێک نەمر کەم؛
بۆ کیژانی پۆتسدام
جێی ژوان نێزیکتر کەم؛
(دیتسکی میر)ی مۆسکۆ #
پڕ گەزۆی سلێمانی،
(ئەلێکساندەر پلاچ)یش #
پڕ کێشوولە و کۆترکەم!

* * *

هەوری ژان بەئاسمانا،
وەک کەشتی بە دەریادا،
ڕووی کردۆتە مەفتەن و
گوێ بە کەوشەنان نادا.

بانگم دەکا: « وەرەوە!
لێرانە، لەو کێوانەی
پوورەی مێش و مەگەزی
مێژوویان لێ نیشتووە،
تۆ بیری هەورگر و
سیمای خۆت جێ هێشتووە»

١٩٧٧/٧/٢٩ - پۆتسدام

---

# دێتسکی میر: مغازەیەکی گەورەی کەلوپەلی منالانە لە سێنتەری مۆسکۆدا.

# ئەلێکساندەر پلاتس: ناوی مەیدانێکی گەورەی ڕۆژهەلاتی بەرلینە.

# چاوی تۆ

ئەگەر لەناو جەنگەڵێکی چڕدا ون بم،
ئەگەر لەناو زەریایەکی پەرکەمدارا
کەشتیم تووشی گێژەنێک بێ و سەراوین بم:
ترسم نییە،
تا چاوی تۆ قیبلەنما و ڕێبەرم بێ.
تا چاوی تۆ نێزیکترین بەندەرم بێ.

* * *

خەڵک گوێ لە ڕادیۆ دەگرن،

بۆ ئەوەی کژ پێشبینی کەن.

منیش، کە ئێوارە دادێ،

تەماشای چاوی تۆ دەکەم:

دەزانم، با لەکوێڕا دێ؛

پلەی گەرما لەچەندەوە تاچەند دەڕوا؛

باران کام کێڵگە ئاو دەدا؛

کام دارستان، کام چیا دەشوا!

١٩٧٧/٨/١٦ ـ پۆتسدام

## بیئاتێ

شەمەندەفەر،

وەک مارێکی سەرلەدوونراو،

گینگڵی دەدا و دەیفیشکاند.

شەو بۆنی ژوانی لێ دەهات...

بۆنی پایز،

بۆنی شیعر،

بۆنی بارانی لێ دەهات.

* * *

گوتی: « ناوم بیئاتێ یه»

مات بووم.

مات بوو.

جگەرەیەکی دەرهێنا.

بۆم داگیرساند...

بەرە بەرە،

لەبەینی پەنجەکانیدا،

جگەرەکە بوو بە سۆتەک.

بەرە بەرە،

لە بەینی لێوەکانیدا،

منی سۆتەک بووم بە جگەرە!

* * *

وەنەوزی دا.

دەستی سەرپەنجە پەمبەیی

وەک نامەیەکی نهێنی،
کە پیلانی کودەتایەکی تێدا بێ،
خزایە ناو دەستم و مەیی.
سەری وەکوو هۆنراوەیەک
هێدی هێدی... لارکردەوە.
منیش شانم وەک دەفتەرێ
تامەزرۆ بوو
هەڵبەستێکی بێتە سەرێ!

خەو بردیەوە.
تا بەیانی خەو بردیەوە.
منیش وەکوو بازرگانێک
گەڕابێتەوە لە سەفەر،
بە درێژایی شەوگاری سارد
زێڕ و زیوی ناو پریاسکەی
خەونەکانی ئەوم ژمارد!

* * *

که بەیانی،

شەمەندەفەری فێگرتوو

سەرمی نایە کۆشی پراگ،

بیئاتێ ـ شاژنی نووستوو ـ

وە ئاگا هات:

ـ گوتن مۆرگن!#

+گوتن مۆرگن!

جەنتاکەی هەڵگرت، دابەزی.

نە ئەدرێس، نە خواحافیزی...

* * *

ئاخ، بیئاتێ!

خۆزگە، سەد خۆزگە، دەمزانی

بەدرێژیی شەو

سەرت لەسەر شانی کێ بوو!

خەونەکانت

کام شۆڕەسوار

مێوانیان بوو تا بەیانی!

ئاخ، بیئاتێ!

خۆزگە، سەد خۆزگە، دەمزانی!

١٩٧٧/٨/٢٢ ـ پراگ

---

# گوتن مۆرگن ( ئەڵمانی ): بەیانی باش

# کوردستان

کێڵگە دەستریێ بۆ باران، چیا بۆ هەڵۆ.
ڕووبار و چەم بۆ نەوەستان، خۆر بۆ ئاسۆ.
ئاگرپەرست بۆ ئاتەشگە، با بۆ چرۆ.
ئەستێرە و مانگ بۆ سپێدە، منیش بۆ تۆ.
کوردستانم، منیش بۆ تۆ!

١٩٧٧/١٠/٥ ـ مۆسکۆ

# من دوو کەسم

من دوو کەسم ـ
لە کاتێکدا،
لەدانسێکی تریفەیی و نەرمۆکەدا،
کەمەربەندی تۆیە دەستم،
لە هەمان کات،
لەگەڵ زارۆیانی چیادا،
لەناو گڕا شایی مردن دادەبەستم.

من دوو کەسم ـ
کە تەماشای لێوم دەکەی،
بزەی ئومێدی تێ زاوە.
کەتەماشای چاوم دەکەی،
فرمێسکی تیا قەتیس ماوە.
من دوو کەسم!

٤ـ٥/١٢/٩٧٧ ـ مۆسکۆ

## بۆ مۆراگ دۆناڵدسن

لەم ژیانەی پڕ هەرادا،
لە بەلەمی شەقوشڕی
بەر تەوژمی پێل و بادا،
زۆر دەترسم
بازی گیانی خەیاڵگری خۆم بزر کەم،
ماوەم نەبێ
دوو پیرۆزەی چاوەکانی تۆ نەمر کەم.

* * *

لە ئێستاوە
من خەمخۆری ئاسمانیشم:
پاش چاوی تۆ،
ئیدی ئاسمان چۆن بتوانێ،
بەیانییان، کە ڕادەبێ،
لە سامالّی خۆی بڕوانێ!

١٩٧٨/٥/٤- مۆسکۆ

# زارۆ

له زۆر کڵێسه‌ی دنیادا
به‌رامبه‌ر ئه‌ڵتار وه‌ستاوم.
له‌میحرابی زۆر مزگه‌وتا
سام دایگرتووم، حه‌په‌ساوم.
به‌ڵام...
هیچ ئه‌ڵتارێ، هیچ میحرابێ
وه‌ک ماڵی زارۆ تیا نووستوو
بۆ من سامی نییه و نابێ!

۱۹۷۸/٦/۳۰ ـ نایبراندنبورگ

# نووشته

نیشتمانم ـ نووشتەیەکە،
عومری هەزاران ساڵ دەبێ.
کە نووح بۆی کردم، پێی گوتم:
« وریابە! کەس نەیکاتەوە.
بکرێتەوە بەتاڵ دەبێ. »

١٩٧٨/٨/٧ ـ کرایفسڤالد

## زللە

ڕۆژتان دەوێ؟!

ڕۆژ لە سنگی ئاسۆدایە،

بە خەنجەران ئاسۆ شەق کەن، ڕۆژ دەربێنن.

سیمای ونبووی خۆتان دەوێ؟!

سیمای ئێوە خەلیفەیەک کردی بە خشت

بۆبنچینەی یەکەم مزگەوت:

بڕۆن مزگەوت بڕووخێنن.

چیتان دەوێ؟
سەربەستیتان؟!
هەزار ساڵە سەربەستیتان
کچە و دەنوێ لەگەڵتانا،
بەڵام کوانێ پیاوەتیتان؟!

١٩٧٨/٨/٨ ـ نایبراندنبرگ

## سەربازی ون

کە وەفدێ دەچێتە شوێنێ،
بۆ سەر گۆڕی سەربازی ون،
تاجەگوڵینەیەک دێنێ.

ئەگەر سبەی وەفدێک بێتە وڵاتی من،
لێم بپرسێ:
« کوانێ گۆڕی سەربازی ون؟»

دەڵێم:

« گەورەم!

لە کەناری هەر جۆگەیێ،

لەسەر سەکۆی هەر مزگەوتێ،

لە بەردەرگەی

هەر ماڵێ، هەر کڵێسەیێ، هەر ئەشکەوتێ،

لەسەر گابەردی هەر شاخێ،

لەسەر درەختی هەر باخێ،

لەم وڵاتە:

لەسەر هەر بستە زەمینێ،

لەژێر هەر گەزە ئاسمانێ،

مەترسە! کەمێک سەر داخە و

تاجەگوڵینەکەت دانێ! "

١٩٧٨/١١/٥ ـ مۆسکۆ

## پاکانە

خۆر تا ئێوارە ئاسمان تەی دەکا،
کەچی ڕێی ئاسۆی قەت لێ تێکناچێ.
ڕووبار هەزاران پەناو پێچ دەکا،
کە چی هەر دەبێ بەرەو دەریا چێ.

له ڕێگەی نێوان

لێکدابڕان و

پێکگەیشتنی من و تۆش، گیانە،

گەلێک باوەش هەن.

بەڵام، هەموویان

ڕێی باوەشی تۆم پێ نیشان دەدەن.

٢/١//١٩٧٩ ـ مۆسکۆ

## هارمۆنیا

بێ تۆ -
نوختەیەکم،
چەرخە دەدەم... لەناو جەغزێکی مەزندا.
لەگەڵ تۆدا -
جەغزی دنیا وێکدێتەوە و
دەبێتە ئەنگوستیلەیەک
لە پەنجەی پیتێکی مندا.

١٩٧٩/٢/١٠ - مۆسکۆ

## هەم تۆم خۆشدەوێ... هەم ئەویش

کە من تەنیا جارێک بژیم:
هەم تۆم خۆشدەوێ، هەم ئەویش.
کە من تەنیا جارێک بژیم:
نە تیشکی ڕۆژ دەتۆرێنم،
نە تریفەی مانگەشەویش.

* * *

ئەگەر دوو جار ژیابام:

خۆشەویستم هەر تۆ دەبووی لەمەیانا.

لەویتردا

ئەوم دەکرد بە تاقانە.

بەڵام... چبکەم!

کە من تەنیا جارێک بژیم،

چارەم نیە،

هەم تۆم خۆشدەوێ، هەم ئەویش.

هەم تیشکی ڕۆژ دەپەرستم،

هەم تریفەی مانگەشەویش!

١٩٧٩/٣/١٦ ـ مۆسکۆ

## نەورۆزی 1979

ئەمساڵ بێ چیا نەورۆز ناکەم.
بێ بۆنی گیا نەورۆز ناکەم.
نەورۆز ناکەم بێ بڵێسەی سووری ئاگر.
نەورۆز ناکەم
گەر ڕەشبەڵەک تۆز نەکات و
بەخۆم نەبمە سەرچۆپیگر.

* * *

کزەی جەرگم،
بەیانی زوو هەڵمسێنە.
زۆر دەترسم:
کەوێک، کارێک،
گوندێک، شارێک،
چەمێک، چیایێک
لەبیر بکەم.
زۆر دەترسم:
دارێک، بەردێک،
کۆختێک، گەردێک،
پنجە گیایەک
لەبیر بکەم.

* * *

بەیانی زوو هەڵمسێنە!
دیسان مەڵێ:

« با تێرخەو بێ »

سوێندم بە چیا خواردووە،

کە کوردستانە دوورەکەم،

بە گەرمێن و کوێستانەوە،

بگوازمەوە بۆ غەریبی - بۆ ژوورەکەم.

٢٠/٣/١٩٧٩ - مۆسکۆ

## ئاوێتەبوون

نازانم چۆن ئاوێتەت بم؟!
ئەگەر بەهەشتی، پێم بڵێ،
تا کڕنووش بەم بۆ گشت خواکان.
ئەگەر دۆزەخی، پێم بڵێ،
تا زەمین پڕکەم لە تاوان.

* * *

نازانم چۆن ئاوێتەت بم؟!

گەر خاکەکی داگیرکراوی، پێم بڵێ،

تا پێستم بکەم بە ئاڵات.

گەر وەک منیش قەرەجێکی،

سنوورێکم بۆ بکێشە،

بۆ خۆت من بکە بە وڵات!

١٩٧٩/٤/٢ ـ مۆسکۆ

## ئەو ساتە خۆشەم هێشتا لە بیرە#

ئەو ساتە خۆشەم هێشتا لە بیرە
کەتۆی نەونەمام،
وەک تاپۆیەکی باڵداری تیژڕەو،
وەک ئیدیاڵێکی ئاسمانی و بێگەرد،
خۆت پێ نیشان دام.

لەناو دوودڵی و سەرقاڵیی ژینا،
دڵ پڕ ئێش و ژان، پڕ نائومێدی،
ماوەیەکی زۆر
دەنگی ناسکت زرینگایەوە و
خەونم بە شێوەی شیرینتەوە دی.

ساڵان هاتن و ساڵان ڕابردن،
گەلێک گەرداوی سەرکەش هەڵیانکرد،
دەنگ و شێوەتیان لە بیر بردەوە،
هەر خەونێکمیان بۆ ئاقارێک برد.

لە تەنیاییدا،
لە بەندیخانەی ئەنگوستەچاوا
ڕۆژانی ژینم بێدەنگ تێپەڕین.
نە خواپەرستی و سرووشیان تیا بوو،
نە دڵداخورپان، نە ئەشک و ئەڤین.

* * *

دلم لێدەدا،
ئاوازی گەرمی لێوە هەڵدەڕژێ،
دیسان، سەرلەنوێ، بن ساباتی ژین
پڕاوپڕ بۆوە:
لە خواپەرستی،
لە ئەشک و سرووش،
لە سیحر و ئەڤین.

---

# تانویۆی ئەم هۆنراوەیە هی پوشکینە و چ نەخشەکانیش هی خۆم

## له یەکەم ڕۆژی شەڕی دژواردا#

له یەکەم ڕۆژی شەڕی دژواردا،
پێش چوونە مەیدان،
نامەکانی تۆم
گشت کۆکردنەوە و گڕم تێ بەردان،
مەبادا دوژمن
وشەی پیرۆز و بەرزی دڵداری
بهاوێتە ژێر پۆستاڵی چڵکن.

* * *

ئێستاکەش کاتێ
ڕووی خۆم بۆ دواوە وەردەچەرخێنم،
لە ئاسۆی دووردا،
لە هەمان جێدا دووکەڵ دەبینم.
وام دێتە بەرچاو
نامەکانی تۆ ئێستاش هەر ماون.
ئێستاش بڵێسە بەری نەداون!

---

# بیرۆکەی ئەم شیعرە لە کایسین کولێف وەرگیـ
دەسکاریی کراوە.

## مۆسكۆ

تا ئەمڕۆ چەند جار
دڵی بێلانەم، بۆ شۆڕەشیعرێ،
داخورپا، لێی دا،
وەک زەنگی دێرێک بۆ نوێژ لێ بدرێ.

« ئەمڕۆ نا، سبەی...»
« ئەمڕۆ نا، سبەی...»

ئەی زمانەکەم!
خۆ ئەتۆ پەیکی بەستە و بڵێسەی،
کەی لە داوێنی پەیکەری پوشکین
مۆمێک پێ دەکەی؟
ئێ دە کەی؟
کەی؟
کەی لە کڵێسەی
شۆر و ئەوینی ئەم نازدارەدا
زەنگێک لێ دەدەی؟
لێدە، دەی!
دەی!

* * *

ئەی مۆسکۆی جوان،#
ئەی مەڵبەندی
گوڵ و بەفر و هەمیشە ژوان!

له ئامێزی نەرمی تۆدا،
بۆ یەکەم جار، بە ئاشکرا،
بەسەرهاتی ئالآیەکم گێڕایەوە،
کە هەڵنەکرا.
بۆ یەکەم جار، بە ئاشکرا،
نەخشەیەکم لە دیوار دا
( ئەوەی بەڕۆژ
لە ئەتڵەسی دنیا دزرا ).

بۆ یەکەم جار، بە ئاشکرا،
مزی هەڵبەست:
دەست و کوڵم،
لێو و گوڵم
پێشکەش کرا.

بۆ یەکەم جار لە ژیانا،
چاوم شەرمی لە خۆر شکا؛
بۆ ئافرەتان،
جێی ژوانم
لە شوێنێکی ڕووناک دانا.

* * *

ئەی مۆسکۆی جوان،
ئەی مەڵبەندی گوڵ و بەفر و هەمیشە ژوان!
دەگێڕنەوە،
دەڵێن، گۆران
بە بینینی
دوو چاوی « پڕ لە هەستی جوان » #
لێوی سیسی بووە کانی،
ترۆپکێک بوو،
ژانی گرت، هەژا، خرۆشا،
پڕی کردی لە گۆرانی!

من گۆران نیم،
بەڵام... ڕەگم
چۆرێک خەم و داخورپانی
گیانی ماندووی ئەوی تیایە.
من لووتکە نیم،
بەڵام... دەشێ...
کڵاوەی سەوزی گردێک بم،
کە لە سایەی لووتکەدایە.
ئەی نازانم،
تاکوو ئەمرۆ
چەند دڵۆپە زەردەخەنە و فرمێسکی گەش:
(هی چاوی کاڵ،
هی چاوی شین،
هی چاوی ڕەش... )
لە گێژەنی شەوەزنگی غەریبیمدا
سووتان وەک مۆم،
درەوشانەوە وەک چرا...

ئەی نازانم...
بۆچی لە بەر ڕووناکییان
شیعرێکم بۆت پێ نەنووسرا؟!
ئەی مۆسکۆی جوان،
ئەی مەڵبەندی
گوڵ و بەفر و هەمیشە ژوان!

١٩٧٩/١/١٨ – مۆسکۆ

---

#دەربڕینێکی گۆرانە لە هۆنراوەی «مۆسکۆی جوان»دا.
## دەربڕینێکی گۆرانە لە هۆنراوەی «وەلامی پرس» دا.

## جیهان

جیهان ـ قەحپەیەکی کەڕە،
جیهان ـ قەحپەیەکی لاڵە.
هەر کەسێکی بە چۆڕێ نەوت
بەندەخوێنی نەکاتەوە،
فەرهادێکی ڕەنجبەتاڵە!

* * *

جیهان ـ قەحپەیەکی کەرە.

جیهان ـ قەحپەیەکی لاڵە.

ئەمڕۆ نییە، دەیان ساڵە،

ئەشکی چاوم

زەنگوڵ زەنگوڵ، دانە دانە،

خوێنی دڵم

دڵۆپ دڵۆپ، دانە دانە،

بۆ گەردنی شووشەنەوتێک

دەکاتە مۆریی گەردانە!

١٩٧٩ – مۆسکۆ

# کەڕەنای جەنگ

گوێتان لێمە؟
من کەڕەنای جەنگ لێ دەدەم،
جەنگێکی پیرۆز و نەمر.

گوێتان لێمە؟
من مژدەی جەنگێکم پێیە،
لە هەموو جەنگێ گەورەتر!

گوێتان لێمە؟
من کەڕەنای جەنگ لێ دەدەم.
بێ ئەو جەنگە پەست و سووکین.
بێ ئەو جەنگە،
هەڵۆی چیا نین: نێرەمووکین.
بێ ئەو جەنگە،
ئەگەر مێژوو زەڕەبینیش لە چاو بکا
نامانبینێ، هێند بچووکین!

* * *

گوێتان لێمە؟
من کەڕەنای جەنگ لێ دەدەم.
جەنگێکی وا کە بۆنی ئاهەنگی لێ بێ.
من نەفرەت لە جەنگێک دەکەم،
بۆ ئەوە بێ،
دنیا وەک پێش جەنگی لێ بێ!

١٩٧٩/٣/١٥ – مۆسکۆ

## ژیانەوە

جارجارە خەم تا هەوکم دێ.
ئازار دەگاتە ڕادەیەک،
ژینم بدەم بە بەردێکدا،
وردی بکەم وەک بادەیەک!
کەچی، لەپڕ:
ورشەی هەودای هزرێکی نوێ،
سەرەتاتکەی کەڵکەڵەیێ،

ژیانەوەی پنجەگیایێ،
زەردەخەنەی کۆرپەلەیێ،
بەژن و بالای شۆڕەژنێ،
سنگی سەرکێشی خڕپنێ -
وام لێ دەکەن
لەخۆشییان لێم بڕوێ باڵ؛
لە ئاسمان بپارێمەوە،
پردی ژینم وا درێژکا،
نەپەڕمەوە بە هەزار ساڵ!

٩/٥/١٩٧٩- مۆسکۆ

## دایك

بۆ جەمیلە ـ سەردادەخەم.

بۆ ژان دارک و ترێـشکۆڤە ـ سەردادەخەم#

بەڵام ژنێک، لە خاکی پڕ مەرگی مندا،

پێ لە جەرگی خۆی بنێت و ببێ بە داک،

لە بەرپێیدا کڕنووش دەبەم،

ناوچەوانم دەسووم لە خاک!

١٩٧٩/٨/٣٠ – پۆتسدام

---

# **جەمیلە بوحەیرەد**: کچەفیداکاری جەزائیری.

**ژان دارک**: کچە قارەمانی فەرەنسی.

**تریشکۆڤە**: یەکەم ژنە کۆسمۆناوت (گەردوونگەڕ).

# مەرج

من قەت دژی ئەوە نیم
دکتاتۆر جیهان بگرن،
سێبەری خوا بن، زۆر بن.
بەڵام مەرجێکم هەیە:
مناڵان دکتاتۆر بن!

٢٢/١٠/١٩٧٩ بەرلین - وارشۆ

## ناونیشان

تا هەڵبەستێک تەواو دەبێ،
من ڕۆحی خۆم پەڕە دەکەم
وەکوو هەلاج.
کە تەواو بوو،
خاڵێک دەکەم بە عەرش بۆی،
ناونیشانێک دەکەم بە تاج.

* * *

هەر قورینگێک
جارێک باڵی لە دەریاچەی
ئەڤینی من هەڵکێشابێ،
بۆتە وشە بۆ هەڵبەستێک،
کە عومرێکە دەینووسم و تەواو نابێ!

* * *

هاوڕێم، ماندووم!
وا هەست دەکەم،
هەڵبەستەکەم هێندە درێژدادڕ بووە،
دیوانی بوون لێی پڕ بووە...
ئاگام لێیە، لە یادمدا
جێگۆڕکێ دەکەن پەیڤەکان.
ڕێگەم بدە خاڵێک دانێم،
تۆی بۆ بکەم بە ناونیشان!

١٩٧٩/١١/٩- مۆسکۆ

## شپرزەیی

ئەو ڕۆژەی ژوانمان هەیە،
هەرچی دەستی بۆ دەبەم:
پیاڵەی چا، کتێب، قەڵەم...
هەموو گوڵاو دەردەدەن.
ئەو ڕۆژەی ژوانمان هەیە،
هێشتا زووە و تۆ دووری،
ئەندامەکانی لەشم نۆبەتبڕی لێک دەکەن:

چاو ـ ڕەزی لەشت دەڕنێ،
دەست ـ بە دەنگتا هەڵدەزنێ،
گوێ ـ نوقمی بۆنت دەبێ و
مەودای دووریت دەپێوێ...
بریا دەتزانی، گیانە،
ئەو ڕۆژەی ژوانمان هەیە،
چۆن سەرم لێ دەشێوێ!

١٩٧٩/١١/٢٢– مۆسکۆ

# شەونوێژی نامۆیان

## (١)

لە هەرجێیەک چیا ببینم -
دڵم،
وەک لە ژوانی یەکەممدا،
دادەخورپێ، ڕادەچڵەکێ،
سەرسام دەوەستم لە بنیا...
وا تێدەگەم،
لە چیای منڕا دەست پێ دەکەن
چیایەکانی هەموو دنیا!

(٢)

لە هەر کوێ کانی ببینم ـ
دڵم،
وەک لە ژوانی یەکەممدا،
دادەخورپێ، ڕادەچڵەکێ،
پێش ئەوەی بینی پێوە نێم،
لە بەردەمیا بەهێمنی چۆک دادەدەم،
قەوزەی سەری
وەک شابسکی شۆڕەژنێک شانە دەکەم،
چونکە من وام بەبیردا دێ،
کە شیرناوی گشت کانییەکان
لە نیشتمانی منڕا دێ!

(٣)

سەرمای گەلێک شارانم دی،
بەڵام پەنجەم لە گۆ نەچوون،
چونکە سەرمای هەموو جێیەک
تیشکێک ڕۆژی نیشتمانی منی تیایە.
گەرمای گەلێک شارانم دی،
بەڵام گیانم وەڕس نەبوو،
چونکە گەرمای هەموو جێیەک
سروەیەکی نیشتمانی منی تیایە.

(٤)

چاوی کیژی ئەوروپایی

گەر شینیش بێ ـ خۆشم دەوێ.

گەر سەوزیش بێ ـ خۆشم دەوێ.

وا تێدەگەم:

شینترین چاو،

سەوزترین چاو

لەم دنیایە،

تۆزێک ڕەشیی

چاوی کچی

نیشتمانی منی تیایە!

(٥)

نیشتمانم!

تۆ وەک تانەی لەسەر چاوم.

تۆ وەک تەمی، لە گشت لاوە دەورەت داوم.

تۆ ئاوێنەی -

لە ناو تۆدا هەموو دنیا بەدی دەکەم.

تۆ تەیمانی -

بە هۆی تۆوە هیچ نابینم:

نە کەل دەبینم، نە زەوی.

نە خوا دەبینم، نە ئاسمان.

جا نازانم

نە جیهان وەک تۆ بچووکە،

نە تۆ گەورەی بەقەد جیهان.

نیشتمانەکەم - ک و ر د س ت ا ن!

١٩٧٩/١١/٢٩- مۆسکۆ

## دارستانی سووتاو

هەر نازدارێ دڵی دامێ،
لە بناری دڵدا ناشتم، وەک نەمامێ.
تا وام لێ هات،
لەسای سەری خۆشەویستان،
بوومە ماخۆی شادارستان!

* * *

تۆم ناسی،
ی نەمامی شلک و نەمر،
م زانی تۆش دەچیتە پاڵ ئەوانی تر:
ڕۆیی، دەبیت
فێنکایی... بۆ هاوینم.
گەرمایی... بۆ زستانم.
چی، لەپڕ، بووی بە شەمچە و
ت بەردا دارستانم!

۱۹۷۹/۱۱/۳۰- مۆسکۆ

# جیهانی ئازاد

جیهانی ئازاد
هێندەی گوێ هەڵخا
بۆ زەمزەمەی نەوت لە جەرگەی خاکا،
کەڕ و کووڕ بووە،
هەست بە سووتانی لووتکەی کێو ناکا!

مۆسکۆ -١٩٧٩

## ئەمشەو تا بەری بەیانی...

ئەمشەو، تا بەری بەیانی،
نەنووستم و سەرنجم دای.
چەند جارێک دیتم ڕاچەنیت.
چەند جارێکیش دیتم گریای.

خەونت بە چییەوە دەدی؟
چبوو؟ بۆچی ڕادەچەنیت؟

لە حیلەی ئەسپی خەمی من؟

لە ئاورینگی قەڵەمی من؟

لە هەڵبوون و کوژانەوەم؟

لە فڕین و نیشتنەوەی بێ بڕانەوەم؟

چبوو، گیانە؟

لە خەونتدا کچێکی دیم لەگەڵدا بوو؟

یا بۆ وڵات

بارگەوبنەی خۆم تێکنابوو؟

* * *

من لە خەمی تۆ ناترسم!

من دەزانم،

خەمەکانت

وردن، قشتن، ژیکەلانەن...

من دەزانم،

ەمەکانت
کوو خەمی هیچ کەسێک نین:
نکەمرواری و زەنگیانەن!

، چاوەکەم،
سان گیانم تژی کەوە
منالّی و تاسەی یاری...
ێسکەکەت بکەرەوە،
م هەڵڕێژە
نکەزەنگیانە و مرواری!

زستانی ۱۹۷۹- مۆسکۆ

## شێتی

دەزانم، تۆ وشەیەکی.
بەڵام زۆر جار، بۆ وشەیەک،
هۆنراوەیەکم کوشتووە!
دەزانم، تۆ خونچەیەکی.
بەڵام زۆر جار، بۆ خونچەیەک،
گوڵجاڕێکم جێهێشتووە!

تشرینی دووەمی ١٩٧٩- مۆسکۆ

# فەرهەنگۆک

## ئـ

**ئاخـڤاندن**: دواندن، بە قسە هێنان

**ئادگار**: سیما، بچم، قەڵافەت،( ملامح )

**ئارمووشین**: ئاوریشمین

**ئاژانس**( لاتینی ): وەکالەت/ ئاژانسی دەنگوباس: وەکالەتی دەنگوباس ڕاگەیاندن

**ئاورینگ**: ئاورنگ، چریسک، پریشکی وردی ئاگر.

**ئۆفیس**: نووسینگە، دائیرە

**ئەسر**: ئەسرین، فرمێسک، ئەشک، ڕۆنتک

**ئەنی:** ناوچەوان، تەوێڵ، هەنیە

**ئیدیا:** ( گریکی ): بیرۆکە، هزرۆکە ( فکرە)

**ئیدیاڵ:** نموونە، میسال

## ب

**بسکۆڵە:** بسک و ئەکریجەی بچووک

**بنەوشیلە**: بنەوشۆکە، بنەوشە، قەزوانێکی وردی مەیلەو نەرمی کەسکە

**بەتڵ:** بەش، پشک

**بەرزەفت کردن**: گرتن، کۆنترۆڵکردن، خستنە ژێر ڕکێف

**بەلەك**: پووز، باق، لە گۆزینگەوە تا ئەژنۆ

**بێن** (بین ) : هەناسە، پشوو. هەوک، قوڕک، گەروو/ بێن پێوەنان: دەم پێوەنان و خواردنەوە.

## پ

**پرشە:** ورشە، شەوقدانەوە، بریسکە

**پەرکەم:** فێ، گلاراو

**پەڕەمووچە:** پەڕی باڵندە ( بۆ قلّچەی وێنەکردن بەکار هاتووە)

**پەیك:** قاسید، پۆستەبەر

**پیرۆزە**: پێرووژە، هوما، بەردێکی بە نرخی ڕەنگ ئاسمانییە

**پێل**: شەپۆل

### ت

**تاپۆ**: تارمایی، ڕەشانگ، سامۆتک

**تژی**: بڕ، مشت

**تۆتکەگرتن**: ئارامگرتن، ئۆقرەگرتن، هەدادان

**تونێل**: ڕەهەند، نەفەق، ڕێگەی ژێرزەمینی

### ج

**جێژوان**: ژوانگە، جێی پێکگەیشتنی دڵداران

### چ

**چەلین**: جۆرە گۆرەوییەکی ڕەنگینی کوردەوارییە

### د

**داوەڵ**: دارێکە پەڕۆی پێوە دەئاڵێنن له ناو شینایی بۆ ڕەواندنەوەی باڵندان

**دوڕگە**: گراف، جەزیرە

**دەوار**: چادر، خێوەت، ڕەشماڵ

**دەندە**: پەراسوو

**دیالۆگ**: گفتوگۆ

### ر

**ڕاشکان**: بەسەرچوون

**ڕکە** : بێرکم، توولە،قەفەز

**ڕۆحئەنگێو**: ئەوەی گیان دەپێکێ

**ڕەوت**:ڕۆیشتن

**ڕەوان**: گیان، ڕۆح

**ڕێژسیۆر**:موخریج، دەرهێنەر

## ز

**زنار**: تاشەبەرد، گابەرد، کەڤری کەلەک مەزن

**زەمزەمە**: لەبەرخۆ گۆرانی گوتن، ورینگە ورینگ، ورینگاندن. بەزم و دەنگەدەنگ

**زەنگۆڵ**: تنۆک، دڵۆپ، پشک

## س

**ساپساپانێ**: خەتخەتین

**ساپیتە**: بنمیچی خانوو

**سارغ**: سەللاجە، سارنجۆک

**سرووش**: وەحی، ئیلهام

**سوژێت**: ناوەرۆک، زنجیرەی ڕووداو لە بەرهەمی هونەریدا

## ش

**شابسك**: بسکی سەرتۆپ، ئەگریجەی جوان و بەدەو

**شالوور**: جۆرە بولبولێکی دەنگخۆشە

**شەمچە**: کەلەشقارتە، دەنکەشقارتە. شقارتە، شخاتە، پێتک، نەفتک، گرتەک

**شەوین:** شەولەوەڕ

## ق

**قنیات کردن:** قایل بوون، قەناعەت کردن

## ك

**کاژەڵە:** کاژەرە، کاسەسەر، قەحف، کاپێل، کاپێلک

**کاژێر:** شەویلاک، شەویلە

**کژ:** وەرز، فەسڵی ساڵ

**کودەتا:** ئینقیلاب

**کۆرس:** دەورە، خولی خوێندن

**کۆڤان:** خەفەت، ئازار

**کولم:** کولمە، گۆنە، ڕوومەت

**کۆنتینێنت:** کیشوەر، قارە

**کەرەنا:** شەیپووری مەزن، ئامرازێکی بۆرییئاسای موزیکە

**کەڤر:** بەرد

**کەڵکەڵە:** خولیا، خەیاڵ، مەراق

**کەوشەن:** سنوور، تخووب، سەرحەد

## گ

**گرامەر** (گریکی): ڕێزمان، دەستووری زمان

**گولووك:** گوڵی کێوی، کوریک

## م

**ماخۆ**: خاوەن، خودان، خێو، ساحێب

**مز** : دەستهەق، کرێ

**مشوورخواردن**: خەم خواردن، بە تەنگەوەبوون

**مۆری**: مووروو

**موزێ**: مۆزەخانە ( پاشگری «خانە» زێدەیە و بەکارهێنانی هەڵەیە)

**موغ**: پیاوی دین لای زەردەشتییان

## ن

**نەوا**: ئاواز، پەنا، داڵدە، نووا، ئارامگە، جێی حەوانەوە

**نەومەمیلە**: مەمکی تازە پێگەیشتوو

**نیفۆ**: پزووی دەرپێ

**نیهاد**: ویژدان

**نێڵە**: گرفە، کڵپە، لرفە، دەنگی پێت و هاڵاوی ئاگر

## و

**واگۆن**: فەرغۆنی شەمەندەفەر

**ورشە**: بریسکە، بریقە، گرشە

## ه

**هزر**: بیر

**هەژمەت**: حەژمەت، داخ، خەفەت، سوێ، تاو

**هەڵزنین**: سەرکەوتن، هەڵگەڕان ( بە بەرزاییدا )

**هەڵکورمان:** گرمۆڵەبوون

**هەودا**: دەزوو، داو

**هەوك:** :قوڕک، گەروو، حەفک، بێن

# ناوەرۆک

## فرمێسک و زام

## بتی شکاو

## شەونامەی شاعیرێکی تینوو

## ١٢ وانە بۆ منالاّن و چەند شیعرێکی قەدەغە

## شەو نییە خەونتان پێوە نەبینم

### ڕۆژ نییە لێتان تووڕە نەبم



### شەو نییە خەونتان پێوە نەبینم

